مۆشانۆكۆگی سانیاتسۆ
MUSAANOKOJI SANEATSU

# وڵاتی پیاوە بچووکەکان





چیرۆك لە چین و ژاپۆنەوە

وەرگێڕانی
موحسین جینی

دووەمین چاپ

مۆشانۆکۆگی سانیاتسۆ
MUSANOKOJI SANEATSU

# ولاتی پیاوه بچووکەکان

## چیرۆک لە چین و ژاپۆنەوه

وەرگێرانی
موحسین چینی

**خەونێک لە وڵاتی پیاوە بچووکەکان**

بابەت: چیرۆک

وەرگێڕانی: موحسین چینی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپ: چاپخانەی شەهاب – هەولێر

دووەمین چاپ

نرخ: 1500 دینارە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە سپاردنی(٧٩٥)ی ساڵی (٢٠٠٧)ی دراوەتێ

# ولاتی پیاوە بچووکەکان

بەخۆشم نەمزانی چۆن بوو ، خۆم لەبەردەگای پیاوە بچووکەکان بینییەوە راوەستابووم و سەیری بەردەرگاکەیانم دەکرد . لەسەر دەرگاکەش ئەم یاسایانە بە پیتی گەورە نووسرابوون .

– نەگریسن ئەوانەی لە ئێمە بەختەوەر ترن !

– نەگریسن ئەوانەی لە ئێمە تێگەیشتووترن !

– رێز لەوانە بگرن کە لە ئێمە ماندووتر و ، هیچ و پووچ ترو، کەمترن .

– سەر بۆ ئەوانە دابنوێنن کە لە ئێمە ستەملێکراو تر و هەژارتر و ماڵوێرانترن .

بێ ئەوەی لە بنەچەی مەسەلەکەش تێگەیشتبم کارەکە وا رێککەوت بوومە یەکێك لە دانیشتوانی ئەم ولاتە .

بەراستیش خەڵکی ئێرە خوو رەوشتی چاکیان هەیە و یاساکان بەوردی پەیرەو دەکەن . بە نەبوونی خەڵك دەشێوێن و غەمگین دەبنەوە ، بە ناخۆشی و دڵتەنگی خەڵك تێکدەچن و ئارەزووی ئەوەش ناکەنەوە کە دڵخۆشیان بکەنەوە ، چونکە هەردەم حەز دەکەن بیرو هۆشیان لە لای بەختەوەری و کامەرانی خۆیاندا بێت .

لێرەدا ئەوەی ئەخۆش بکەوێت بەزەیی هەموویان دەوروژێنێت بەڵام کاتێ چاکدەبێتەوە کەس دڵی پێ خۆش نابێتەوە .

بە رێکەوت ئەم کەسەم بینی کە لە جوانیدا هاوتای نەبوو و ، زۆر بەناوبانگ بوو . کەچی سەیر دەکەم بەردەوام سەرزەنشت دەکرێت و رسوا دەکرێتەوە لەبەر ئەوەی کە جوان و نازدار بوو ، ئافرەتانی دیکە حەزیان دەکرد لە جوانییەکەی کەم بکەنەوە ، بەم کردەوەیەشیان دڵخۆش بوون و ، ئەوانەی بەراستیش شۆخ و شەنگ بوون هێندە سووك و سەرکۆنە کرابوونەوە بەرادیەك وا هەستیان بەخۆیان دەکرد کە بەراستی ناشیرینن .

بەناوبانگترین چیا لەم وڵاتە نزم ترینیانە ، لە هەمووشیان سەرفرازتر و بە ئابڕووترە ، لەبەر ملهوڕی و شێتایەتی خۆی، بە چاوی سووك و بێ بایەخ سەیری چیایە سەرکەشە پۆپە سپییەکەی بەرانبەر خۆی دەکات . ئەم خەڵکە لێرە بەوە سەرمەستن کە جوانووی ماین زۆر جوانە ! بەڵام ئەگەر بەجوانی گۆلکێك هەڵبدەیت ، تۆ بە پیاوێکی دواکەوتوو و کۆنەپەرست لە قەڵەم دەدرێیت . ئەو کەسانەی لەم وڵاتە بەزانا و تێگەیشتوو دادەنرێن ، لە راستیدا خەڵکی نەزان و نەخوێندەوار و گەمژەڵ و گەڵحۆ و بێ ئیش و کارەکانن کە شەو و رۆژ لە کووچە و کۆڵان و مەیخانەکاندا دەسووڕێنەوە.

کاتێ پێی دەڵێیت تۆ بلیمەت و داهێنەریت زەردەخەنەی خۆشی لە سیمای نابینیت ، هەر چەند ئازاری بدەیت روخساری تێکناچێت و وەکو پەیکەر راوەدەستێت و نابزوێت . هەر چەند سووکایەتی پێبکەیت ئەوانی دیکە پێی دەگەشێنەوە . لەم وڵاتە وا باوە بە کەرایەتی و گەلۆری خۆتدا هەڵبدەیت و شانازی بەبێ هۆشی خۆت بکەیت . ئەگەر شتێکی راست و دروست و رێکوپێکت بۆیان باس کرد رووی خۆیان لە لایەکی دیکە دەکەن گوێ لە قسەکانت ناگرن و وا دەزانن تۆ شێت بوویت و هورێنە دەکەیت و بەچاوی کەم سەیرت دەکەن . ئەوەی نەختێك هۆشی ببزوێت.. نەفرەتی لێدەکەن ،ماڵی خۆیان لێی دوور دەکەنەوە و ناوچەکەی بە گشتی بۆ چۆڵ دەکەن .

نموونەی بەرزی لەم وڵاتە ئەوەیە کە شتی پڕوپووچ و گاڵتەپێکرن بە هەمان شتی پڕوپووچ و گاڵتەپێکردن بەراورد بکرێتەوە .

لەم وڵاتە بێ بەختە هەر چەند گێل و دەبەنگ بیت ، پتر رێزت لێدەگرن و ، پتر باست دەکەن . لە نێوەندکەش ناوبانگ دەردەکەیت و ، لە لای ئەم کەسانە ستایشکردن و پێهەڵگوتنی کەسانی دی کارێکی جەستەییە ، هەر چەند ئازار بچێژیت پتر ستایش دەکرێیت و بەشان و باڵاتدا هەڵدەگوترێت ، لەم وڵاتە رێزلێنان لە گەورە پیاوان سووکایەتی پێکردن و پتر ئازار پێگەیاندنە .

خەڵکی ئێرە بە گشتی روو گرژن ، ئەگەر یەکێك بەرێکەوت پێبکەنێت ، لە هەموو لایەکەوە رەخنەی لێدەگیرێت ، لەوانەشە بە توندی سزا بدرێت و پێی بڵێن لە بەرانبەر ئەم خەڵکە هەژار و مەلوول و روو ترش و مزرانە چۆن پێدەکەنیت ؟

لەو بڕوایەشدا مەبن خەڵکی ئم ولاتە بە دوای خۆشی و شادیدا بگەرێن ، بەلام چی بکەن ، ئیمرۆ بێ دەسەلاتن ، ئەستێرەیان لە ئاسۆدا ئاوا بووە و ئەمە زەمانە و لە خەڵکی دیکە جیاکراونەتەوە و لە دنیای پان و بەریندا بە تەنیان .

لە بەردەم ئەمانە هەر چەند بگرییێت باشترە ، هەموویان بەدەست ئازار و ئەشکەنجەی لە شیانەوە دەناڵێنن ، لە مبارەیەوە لە یەکێکیانم پرسی ، لە وەلامدا گوتی :

ئێمە هەمیشە لە ئازاردایـن و ، ئێش و ئازارەکانمان هێندەی ئەوەیە کە شادی و کامەرانی خەڵکی دیکە نەتوانین لە ئەستۆ بگرین . خۆشی دەربڕین تاوانە ، خەڵکی دیکە رق و کینەت لێهەڵدەگرن .

لە سەردەمی کۆندا ، جەنگاوەران دەبوایە لە بەردەم ئێش و ئازارەکان چۆك نەدەن ، هەر چەند سزای پتر بووایە ، دەبووایە لە روی دوژمندا پێبکەنێت ، کەچی ئێمە لە خۆشیدا پێدەکەنین و لە ناخۆشیشدا روومان گرژ و مۆنە .

ئەگەر چی لەم سزاو ئەشکەنجەیە هەر ئێمە بە تەنیا نەبووین. لەم بارودۆخە هەر چەند فرمێسکی خۆم بشارمەوە، حەز دەکەم پێبکەنم .. تۆ ئەگەر هەر بزەیەکی

لێوت بێت خۆت دەخەیتە بەرشالاوی رەخنە و تا بەکۆڵ نەگرییێت و فرمێسك بەسەر هەردوو کۆڵمتدا رێچکە نەبەستێت وازت لێناهێنن .

بەم شێوەیە دانم بەخۆمدا گرت و هەوڵمدا هەرگیز پێنەکەنم.

ئیدی رۆژێك لە رۆژان وەکو جاران لەم ناوە دەگەڕام و یەکێکی قوتەبنە لێم نزیك بووەوە ، لێی پرسیم :

– ئەمە سەیری چی دەکەیت ؟

– سەیری بەرزی ئەم چیایە دەکەم .

– ئەم چیایەت خۆش دەوێت ؟

لەم کاتەش هیچ زەینم لەسەر یاساکانی ئەم ولاتە نەبوو و بارودۆخە پێچەوانەکەشم لە بیر نەبوو . بۆیە یەکسەر گوتم:

– بۆچی ، ئەی ئەم چیایە لە گشتییان سەرکەشتر نیە ؟

– بەڵێ لە هەموویان سەرکەشتر و گەورەترە .. لەبەرچی پێت سەیرە .. ئەی بەچاوی خۆت نابینیت ! چاوت پێوە نیە..! ئەمە ئەو پەڕی ملهوڕییە ، تۆ نابینییت ئەم چیایە لووتکە سپییە چۆن سەیری شاخەکانی دەوروبەری خۆی دەکات ، کەس نیە بیبینێت و لە ئاستی بالا بەرزی و شۆخ و شەنگیدا مەست و سەرسام نەبێت .

– بەڵێ ، ئەوەی فەرمووت راستە !

– ئەمجارە چاوپۆشیت لێدەکەم ، بەلام جارێکی دیکە شتی لەم بابەتە بکەیتەوە ئاگاداری خەڵك دەکەمەوە و خەڵکت بەگشتی لێ هان دەدەم ، چونکە تۆ چاوچنۆکی ، چێژ لە سزادان و ئەشکەنجەدانی خەڵك وەردەگریت ، شادی و

کامــەرانی ڕووی خــەڵك دەدزیــت و ، خوێنیــان دەمــژیت ، ئەوەی ڕەوشتی چاکە تۆ نیتە .

بــەڵێنم پێــدا چــی دی بــیری وا نەکەمــەوە و پــتر پابەنــدی یاســاکان ببمــەوە ، کەچــی هێــشتا چــەند هــەنگاوێك دوور نەکەوتبوومەوە ، کە سەر لە نوێ بیرم لەم مەسەلەیە کردەوە، بەدەســتی خــۆم نــەبوو لــە ناکــاو بــە عــەقڵی ئــەم خەڵکــە پێکــەنیم.. پــتر پێکــەنیم .. قاقــای پێکــەنینم گەیــشتە کــابرای قوتەبنــە ، ئــاوڕی لێدامــەوە ، هەســتم کــرد کــارێکی نــاڕێکم کردووە . دەستم بەدەمی خۆمــەوە گــرت .. بەڵام پاش چــی ، کــار لــە کــار ترازابــوو .. کــابرا بــەغاردان هاتــە لام .. لێــی پرسیم :

– ئەمە بەچی پێدەکەنیت ؟

زۆر لێی پاڕامەوە .. پێم گوت :

– دەستم دامێنــت .. پیــاوی چــاکبە .. ئــەوەی مــن کــردم تــۆ نەیکەیت !

– نــا .. نــا . بــڕوا ناکــەم لــە سەرانــسەری ئــەم وڵاتــە کەسێك هــەبێت لــەم ڕەفتــارەی تــۆ خــۆش بێــت ، چــونکە ئەمــە لێبووردنی بۆ نیــە .. پێم بڵــێ ، چۆن بەخۆت ڕەوا دەبینیــت لــەم وڵاتــە خــەڵك بــە گــشتی ســزادراون و لــە ژێــر بــاری ئەشــکەنجەدا دەتلێنــەوە .. تــۆش پێبکــەنیت .. ئایــا وا دەزانیت کە تەنیا تۆ هەست بە گەورەیی ئەم چیایە دەکەیت؟ نــەخێر تــۆ هەڵەیــەکی زۆر گــەورەت کــردووە پێویــستە لەگــەڵ مندا بێیت !

کابرای قوتەبنە منی بە پێش خۆی داو گەیاندمیە شوێنێك کە خەڵکێکی زۆری تێدا بوو .. رووی لە خەڵکەکە کردو پڕ بەدەمی خۆی هاواری کرد :

خەڵکینە هەمووتان گوێ بگرن .. ئەم کابرایە پێویستە لە سێدارە بدرێت !

گوتیان :

– چ تاوانێکی کردووە ؟

– ئەم کابرایە ، لەبەرچاوی من ، بێ ئەوەی شەرم لە خۆی بکاتەوە ، ئەم چیایەی کە ئێمە گشتمان دەیبوغزێنین ، ئەو هەوەسی پێدێت و بەدیداری دەدروشێتەوە .

گوتیان :

– ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت راست بێت ، سزای کوشتنە !!

ئینجا لەمەش خراپتری کردووە .. پێکەنیوە .. هێمنی و ئارامی هۆشی منی شێواندووە . ئەگەر ئێوە گوێتان لە پێکەنینەکەی دەبوو . چەند رۆژ و چەند مانگ ئارەزووی خواردنتان نەدەکرد !

– بیکوژن .. بیکوژن .

لێرەدا بە ئاگا هاتم و گیانم هەمووی لە ئارەقە نقووم ببوو .

سەرچاوە

الليمون

قصص من اليابان و الصين

## بێـــــــوەژن

مـن کـاتێ لـە زانکـۆی – قـازان – دەمخوێنـد ، لـە ژوورێکـی مـاڵی یـەکێك لـە هاوڕێیـەکانم دەژیـام کـە نـاوی – بجکـۆف – بوو .

خانووەکە زۆر کۆن بوو ، دیوارەکان دارزابوون ، کە سـەیری سـاپیتەی ژوورەکانـت دەکـرد هەسـت دەکـرد هـەر ئێستا دادەتـەپێت ، خانوەکـە یـەك نهـۆم بـوو و بـە گـشتی لـە سێ ژوور پێکهـاتبوو. رەهـێڵ و باوبـژی زسـتان شووشـەی پەنجـەرەکانی شـکاندبوو، ئـەوەی راسـتی بێـت خانووەکـە هێندە بێ سەروبەر بوو لـە کـەلاوە دەچوو . ئەو ژوورەی بۆ من تەرخان کرابوو ، تاریك ، شێدار ، بۆن گـەنی لێدەهات و تیشکی خۆری پێنەدەکەوت .

بجکـۆف هـاوڕێم هـەردەم دڵـی دەدامـەوە و زۆر چـاودێری دەکردم ، حەزیشی دەکرد بمدوێنێت و بە روویـەکی نـەرم و خۆشیش دەیدوواندم .

هەڵبەتە ئەمەش بۆ ئەوە بوو تاکو نیگەران نەبم و لـە غـەریبی دووره خزم و کەسی خۆم حەسرەت نەکێشم و دڵتەنگ نەبم.

دایکـی بـچکۆف تەمـەنی نزیکـەی چـل سـاڵ دەبـوو ، بەسەروسیما ئافرتێکی گران و بەڕێز دیار بوو ، هەر چەند مانـدوو و تـوورەش بوایـە نیمـچە زەردەخەنەیـەکی جـوانی بەسـەر لێوەکانییـەوە دەمایـەوە ، زۆر بـەزەیی بـە مـن

دەهاتەوە، زۆریش هەواڵی دەپرسیم ، ئەو کاتانەی لە ماڵەوە دەبووم دەهاتە لام و لە تەنیشتم دادەنیشت . بە زمانێکی شیرین لە هەوار وخزم و کەسی منی دەپرسی . حەزی دەکرد باسی داپیری خۆمی بۆ بکەم کە لە ماڵەوە بە جێم هێشتبوو . هەروها ئەویش لەم کاتانە باسی رۆژانی منداڵێتی خۆی بۆ دەگێڕامەوە .

ئەو کاتە مێردی پێنج ساڵ دەبوو مردبوو ، مووچەیەکی خانەنشینی کەمی بۆ بەجێ هێشتبوون کە بە هیچ شێوەیەك بەشی خەرجی ژیانی رۆژانەیانی نەدەکرد ، لەبەر ئەمە ئەم ئافرەتە بۆ گوزەرانی ماڵ و منداڵەکانی خۆی تەواو پەرێشان بوو ، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە من لە لایاندا میوان بووم . مانگێکی تەواو لە نێو ئەم خێزانە ژیانم بەسەربرد . لەم ماوەیە وەکو کوڕێکی ئەم خێزانە لە هەموو شتێك بەشداریم لەگەڵیاندا دەکرد .

لە کاتی خواردندا هەموومان بەیەکەوە دادەنیشتین و هەروا لە خۆشی و ناخۆشیشدا هاوکاریان بووم .

رۆژێکیان بیستم بچکۆف لە سەر مەسەلەی خواردن سەرزەنشتی برایەکی بچووکی خۆی دەکاتەوە. پێی گوت: هەی برای شیرینم ، جوان نیە تۆ داوای خواردنی پتر دەکەیت ! تۆ نازانیت ئێمە میوانێکی خۆشەویستمان لە لایە و پێویستە ئێمە ئەم خواردەمەنییەی هەمانە بە یەکسانی لە نێوان خۆماندا بەش بکەین ، هێندەی پێنەچوو دیسان بیستم منداڵەکە لەو قسەیەی کردبووی پەشیمان

دەبووەوە و لە بچکۆڵ برا گەورەی خۆی داوای لێبووردنی دەکرد .

لەمەدا هەستم کرد من لەسەر گوزەرانی ئەم خێزانە بارگرانم، ئەوەی بۆ من دەیکەن چی دی ناتوانن لێی بەردوام بن و سەرەڕای ئەمەش ورە بەرنادەن و پتر دەملاوێننەوە .

بۆیە بڕیارمدا هەموو ئێوارێیەك بچمە بەندەر و لە کاتی پشووی خۆمدا ماوەی کاتژمێرێك یا دوو کاتژمێر لەوێ ئیش بکەم ، بەڵکو بتوانم چەند کۆبکێك پەیدا بکەم و ، خەرجی خواردن و جلکوبەرگی خۆمی پێ دابین بکەم و نەختێکیش لە ئەرکی ئەوان سووك بکەمەوە .

ئیدی ئەوەی مەبەستم بوو هاتەدی ، حەماڵیم دەکرد و ، کەلوپەل و جانتای سووکی گەشتیارانم دەگوێزایەوە و ، لە کەشتییەکان دەمهێنانە خوارەوە ، بۆ هەندێکی دیکەش بارم بار دەکرد .

ئێوارەیەکیان کەشتییەکی گەورە لەنگەری گرت ، لەو کاتەی ئێمە بە هێنانە خوارەوەی سەندووقە چایەکانی نێو کەشتییەکەوە خەریکبووین ، سەیرم کرد ئافرەتێك کە هێشتا لە سەرەتای تەمەندا بوو بە تەنیا لە نێو کرێکارەکاندایە، دوو چاوی گەورەی هەبوو و سیمای ماندوو هەڵکەوتبوو ، وادیار بوو قورسایی سەندووقە چایەکان هێزی تێنەهێشتبوو و پشتی پێ چەماندبووەوە.
بەدەنگێکی نەرمی پچڕپچڕ گۆرانییەکی لەو گۆرانییە بە سۆزانە دەگوت کە مرۆڤی ماندوو بۆ دڵدانەوەی خۆی

دەیلێیت و ئازار و بارگرانی ژیانی دەستکورتی خۆی پێ دەرەوێنێتەوە . خاوەنی کەلوپەلەکان ئەگەر یەکێك لە ئێمەی ببینایە هێواش دەڕۆین، یا خۆمان بە ئەنقەست دوا دەخەین، هاواری سەرماندا دەکرد و دارێکی ئەستووری بەدەستەوە بوو و ئێمەی وەکو رانەمەڕ لێدەخوڕی .

دوای ئەوەی سەندووقە چایەکانی نێو کەشتییەکەمان بە گشتی داگرت . لە سەر پشتی کەشتییەکە بۆ پشوودان دانشتین و ، چاوەڕوانی وەرگرتنی کرێمان دەکرد ، ئافرەتە کرێکارەکە لە تەنیشت من دانیشت ، هۆشی لە خۆی نەبوو ، لە دەریای بیرکردنەوە نقووم ببوو و ، ناوە ناوە وەکو ولاغی ماندوو کە پشووی سوار دەبێت و دەنگێکی نامۆ دەردەکات ئەویش بە هەمان چەشنە ئاخی قووڵی سەیری هەڵدەکێشا و نووزە نووزێکی باریکیشی لێوە دەهات ، ئەمەش سەرنجی راکێشام و هەروا بۆ میانەیی لێم پرسی :

– ناوت چیە ؟

– ماریانا

– بۆ وا غەمباریت ؟ دیارە ماندوویت !

نیوە ئاوڕێکی لەمن دایەوە ، بەلاچاوی نەختێك لەمن راما ، گوتی :

– چی لەم خەڵکە چاوەڕوان دەکەیت کە ژیانیان بە هەژاری و چەرمەسەری بەسەر دەبەن . بۆچی دەتەوێت ئەم خەڵکە خۆشی لە ژیانی خۆیان ببینن و ماندوویەتی پشتیان پێ نەچەمێنێتەوە .

لەم وەڵامە سەرم سوڕما . کە بە ئاشکرا مردنی لەم ژیانە پێ خۆشتر بوو . حەزم کرد پتر بیدوێنم . دیسان لێم پرسی :
- شووت کردووە ؟
- بەڵێ ، بەڵام ماوەی ساڵێك دەبێت مێردم بە گرانەتا مردووە. کوڕێکم لێی هەیە ، تەمەنی سێ ساڵە ، جگە لەم کرێیەی کە ئێستا وەریدەگرم ، کۆبکێکی دیکە لە گیرفانم نیە، زۆر هەوڵمدا لە ماڵان کارەکەری بکەم ، بەڵام لە دەرگای هەر ماڵێکی دەوڵەمەندم دا ، کەس دەرگای لێنەکردمەوە ، نەك لەبەر ئەوەی کە نەمدەتوانی باش خزمەتیان بکەم ، بەڵکو لەبەر ئەوەی منداڵی ساوام هەبوو . تێی ناگەم ئەم ژیانە کوێرەوەرییەی ئێمە چیە لەم ژیانەدا دەیبەینە سەر و تەمەنمان بەگشتی تێدا بەفیڕۆ دەڕوات ؟
من هێشتا کرێی ڕۆژەکارێك وەرناگرم کە سێ چوار ڕۆژی دواتر بێکار دەمێنێمەوە . منداڵەکەم نەخۆشە و لە ماڵی دراوسێیەکم بەجێم هێشتووە تاکو دەگەڕێمەوە ئاگاداری بکەن و ئێستاکەش نازانم چی بەسەر هاتووە ! لەم ساتە خاوەن کەلوپەلەکان داوای کردین تاکو بچین کرێیەکانمان وەرگرین . ئافرەتە کرێکارەکە هەرکە کرێی خۆی وەرگرت لە دوورەوە یەکسەر دەستی خواحافیزی بۆ هەڵشەقاندم و دەیگوت :
(( دنیا زۆر ساردە ، هەورێکی زۆر بەدەرەوەیە ، لەوانەیە ئێستا دەیکاتە باران ، کوڕەکەم نەخۆشە دەبێت زوو بیگەمێ: خوا حافیز )) .

بایــەکی تونــد هــەڵیکرد ، کەشــتییە لەنگــەر گرتووەکـانی بەندەرەکــە ، فیکــەی ترســناکیان لێــدا ، شــەپۆڵەکان بــەرز دەبوونــەوە و، وردە وردە بــەرەو قــەراغ رادەکــشان و خۆیـان لەبــەردەکانی شۆســتەی بەندەرەکــە دەدا و تێکدەشــکانەوە . ئینجا باران بە تـەوژم دەسـتپێکرد هـەورە تریـشقە ئاسمانی روون کــردەوە . ماریانـا بـۆ ئـەوەی زوو بگاتـەوە منداڵەکـەی خـۆی بـە پەلـە دەرۆیـشت و ، بایەکـەش لـە کراسـە تەڕەکـەی دەدا و جـاریٚ بـۆ راســت و جـاریٚ بـۆ سـەرەوەی دەبـرد و ، لەش و لارە باریك و بیٚ هیٚزەکەیشی وەکو ئەوەی سەرخۆش بێت دەلەرییەوە .

سەرچاوە

– الحب –

قصه الارمله

## سەرخۆشێکی دەستپاك

بەیانییەکیان کە خۆر بە جوانی بەدەرەوە بوو – کریل بابلینۆف – ئەندامی لیژنەی ناوبژیوانان پێلوەکانی چاوی خۆی لەسەر یەك دانا و گیانی دەرچوو . هەڵبەتە ئەمەش بە هۆی ئەم دوو دەردە کوشندەیە بوو کە دەبوونە هۆی مردنی ناوەختەی زۆربەی رووسەکان ، لەمەشدا مەبەستم پیاوە سەرخۆش و ورگ ئەستوور و قەڵەوەکانە کە رووسەکان پێی بەناوبانگن .

ئەگەر چی خەڵك خەریکی ناشتنی تەرمەکەی بوون ، بەڵام –بۆلافسکی–ی هاورێیە دڵسۆزەکەی ، خۆی لەوان نەگەیاندو، بەڵکو هەر زوو بەزوو سواری عارەبانەیەك بوو و بۆ لای هاورێیەکی خۆیان کە پێیان دەگوت – زابۆکین – بەرێکەوت. زابۆکین وتاربێژێکی زۆر بە توانا بوو . وتاری لە ئەزبەر دەخوێندەوە ، لە هەر کوێیەك داوایان کردایە ، یەکسەر دەچوو بەبێ پێشەکی یا بەبێ نووسین لەسەر کاغەز، وتارێکی سەرپێی لەسەر بۆنەکە دەدا و ، بۆ ئەمەش نەنووستن و نە سەرخۆشی و نەبارێکی نائاسایی دەروونی گرێی نەدەخستە وتار خوێندنەوەکەی . لە راستیدا پیاوێکی تا بڵێی هۆشیار و زیرەك بوو ، ئەم مەردە لە ناشتنی مردوو بووایە یا لە ئاهەنگی خۆشی و شادی ، وشەکان وەکو

پەنگری ئاگر لە قوڕگی دەردەپەڕین و ماوەیەکی دووردوودرێژ بێ ئەوەی هەر هیچ پشوویەك بدات وتارەکەی خۆی دەدا .
بەراستی ئەم سیفەتە بەجێیانە بوون کە بۆلانسکی هاندا یەکسەر روو لە زابۆکین بکاتەوە .
ئینجا ئەم رووداوە مەزنەی کە رووی داوە ، پێویستی بە وتاربێژێکی زۆر زانی وەکو زابۆکین دەکرد تاکو لە کاتی ناشتنی تەرمەکەدا بەشان و شەوکەتی مردووەکە هەڵبلێت و مەزنێتی و کردەوە نەمرەکانی بەدیار بخات .
ئیدی هەرکە بۆلافسکی گەیشتە ئەم فریشتەیە مەزنە یەکسەر پێی گوت :
– کاك زابۆکین ، من بە دوای تۆ هاتووم ! خێراکە پاڵتۆیەکەت لەبەر بکە و لەگەڵ من وەرە .. ئەم بەیانییە برادەرێکی زۆر خۆشەویستمان مردووە ، سبەی تەرمەکەی بەخاك دەسپێرن ، بەخۆیشت دەزانیت بۆ بۆنەی وا لە تۆ پتر کەسی دیکە نیە ، جگە لە بەرێزتان هیچ کەسێکی خانەدانمان نیە بتوانێت لەسەر گۆڕەکەی دوو وشەمان بۆ بخوێنێتەوە ، هاوڕێی بەڕێزم ، بڕوا بکە ئەگەر مردووەکە هەژار و نەدار بوایە و پلە و پایەی نەبووایە هەرگیز داوام لێنەدەکردی و بەدواتدا نەدەهاتم و نەممانـدوو بوونەشم بەبەر تۆ نەدەدا . بەلام مردووەکە تا بڵێی دەوڵەمەندە و دەستپاکی لێژنەی ناوبژیوانانە . ئەمەش لە ئێمە ناوەشێتەوە کە پیاوێکی گەورەی دەسەلاتداری دەوڵەت بە ساردی و بە بێ دەنگی بینێژین و وتاری بۆ نەخوێنینەوە .

زابۆکین دیار بوو خەوتبوو و لەگەڵ دەنگی هاتنی بۆلافسکی بە ئاگا هاتبووەوە ، یەك دوو جار باوشکی کرد و بەکورتە دەنگێك پرسی :

– دەستپاك ؟ مەبەستت لەمەی خۆرەکەیە ؟

– بەڵێ ، بەڵێ . چاك دەیناسیت خۆیەتی . بەلام خۆشەویستەکەم ئەمەشت لە بیر نەچێت ، بۆ ئێواریێ خواردنی چاکی تێدایە .

کرێی هاتوچوونی عارەبانەکەشت دەدەنەوە ، دەفەرموو هاوڕێی ئازیزم خێراکە با بڕۆین ، جگە لە وتاردانەکە چی ترمان لە تۆ گەرەك نیە .

زابۆکین بێ سێ و دوو بەداوایەکە قایل بوو . ئینجا یەکسەر خۆی بە تەپیو و غەمبار نیشان دا . وەکو نمایشکردنێك ویستی لە ئێستاوە خۆی بۆ دیمەنەکە ئامادە بکات .

بە بۆلافسکی گوت :

– من ئەم دەستپاکە زۆر باش دەناسم ، بەخوا پیاوێکی چەنە باز و ڕەزا گران بوو ، خوا لێی ڕازی بێت ئێستا مردوو بڕایەوە .

کاتێ تەرمەکەیان گەیاندە گۆڕستان ئەوانیش گەیشتنە ئەوێ ، ڕێورەسمەکە دەستپێکرد ، تەرمەکە لەسەر زەوی دانرا ، دایك و خێزان و خوشکەکانی مردووەکە وەکو ئەوەی لەم جۆرە بۆنانەدا باوە بەریز وەستا بوون و فرمێسکیان دەباراند .

زابۆکین ، ئه‌م پیاوه ماقووڵه له عاره‌بانه‌که هێشتا قاچی یه‌کەمی نه‌خستبووه سه‌ر زه‌وی که به ده‌نگێکی زۆر ناخۆش نه‌ڕاندی : (( لێم گه‌ڕێن ، لێم گه‌ڕێن ، با منیش بمرم )) به‌ڵام له راستیدا که‌س به‌م شێوه‌یه سه‌ربه‌خۆی نامرێت و هه‌روه‌ها که‌سیش له ئاماده‌بووان ده‌ستیان نه‌گرت که له‌گه‌ڵ ئه‌ودا نه‌چێته ژێر خاکه‌وه یاخود به‌م نه‌ڕاندنه هه‌ستی که‌سی نه‌بزواند و که‌سیش سه‌یری نه‌کرد . یا بڵێین که‌س به پیلیه‌وه نه‌هات .

زابۆکین دوای سه‌یرکردنێکی کورتی سه‌ر پێیی له ئاماده‌بووان، یه‌کسه‌ر ده‌ستی به وتار خوێندنه‌وه‌که‌ی خۆی کرد ، گوتی :

– ئایا ئه‌وه‌ی به‌م چاوانه‌م ده‌یبینم و به‌م گوێیانه‌م ده‌یبیستم راسته ؟ یا من خه‌ونی ترسناك ده‌بینم و ده‌نگی جنۆکان ده‌بیستم ، به‌ڵێ ئه‌م گۆڕه تاریکستانه ، به‌داخه‌وه ئه‌مانه هه‌موویان راستن ، ئه‌وه‌ی له‌به‌ر چاومانه خه‌ون نیه ، له به‌خت چاکی خۆمانه که چاوه‌کانمان فێڵمان لێناکه‌ن، ئه‌وه‌ی دوێنێ له‌و په‌ری چوست و چالاکیدا بوو ئیمڕۆ سیس و بێ ده‌نگه و به‌یانی ده‌بێته یادگار .. ئه‌مه فه‌رمایشتی خواوه‌ندی میهره‌بانه که پێویسته له‌سه‌ر هه‌موومان جێبه‌جێی بکه‌ین، ئه‌وه‌ی جێی داخه هێشتا له‌سه‌ر هێز و توانای خۆیدا بوو و ئه‌گه‌ر چی به‌ناو ساڵیشدا چوو بوو .

بەڕێزان بە مردنی ئەم پیاوە مەزنە زیانێکی زۆرمان لێکەوت، کێ دەتوانی جێگەی ئەم ڕووخۆشە لە نێو دڵمان بگرێتەوە . ئێمە چەندین فەرمانبەرمان هەیە ، بەڵام کەس وەکو (برۆکۆڤ ئۆزبیتش ) بۆ کارەکەی خۆی دڵسۆز نابێت و زۆر بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەم فەرمانبەرە تاکە نموونە بوو کە شانازیمان پێوە دەکرد .

بەڕێزان ئەوەی لەبەر چاوتانە نموونەی پیاوی دڵپاك بوو ، کە هەست و دەروونێکی ڕاست و بێ فرِوفێڵی هەبوو . بەرتیلی لە کەس وەرنەدەگرت ، هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان بە ڕەوشتی نزم قایل نەبووە . من بەخۆم زۆر بەچاکی شارەزای بووم کە بەرانبەر بەرتیل خۆران بێزاری دەردەبڕی و هەردەم سەرزەنشتی ئەوانەی دەکردەوە کە بەرتیلیان لە خەڵك وەردەگرت ، ئەوانەی بەم شێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵ خەڵکی هەژار و برسی دەکرد بە ڕەوشت نزمی لە قەڵەم دەدان .

بڕواش ناکەم کەس لە ئێوە هەبێت کە نەزانێت ئەم پیاوە پیرۆزە چۆن مووچە کەمەکەی خۆی لەسەر خەڵکی بێ دەرامەت دەبەشییەوە . ئەم بەهەشتییە بە مووچە کەمەکەی خۆی چەندین خەڵکی نەناس و دراوسێی و خەڵکی شارەکەی خۆی پێگەیاندووە . بۆیە ئێستاکەش ئەگەر جوان هەستی خۆتان ڕابگرن گوێتان لە دادو فیغان و نووزەی پیرێژن و بێوەژن و هەتیوان دەبێتەوە کە بە مووچە کەمەکەی ئەم پیاو چاکە دەژیان و لە ژێر سێبەری کردەوە چاکەکانیدا حەسابوونەوە . داخی گرانم .. ئێستاکە چ بکەین کە ئەم

مرۆڤە پاکەمان لە کیس چوو کە هەموو ژیانی خۆی بۆ یارمەتیدانی هەژاران تەرخان کردبوو .

ئەوەی گومانی لێناکرێت ئەوەیە کە ئێوە چاك دەزانن خوالێخۆشبوو بێوەمێرد بوو ، بە بێوەمێردی مایەوە تاکو سەری خۆی نایەوە . ئێستا من سیمای ئەم پیاوەم لەبەرچاوە کە هەموو رۆژێك لەگەڵ بەیانی ریشی خۆی دەتاشی و زەردەخەنە جوانەکانی دێنەوە بەرچاوم ، بەڵکو ئێستا من وا هەست دەکەم دەنگی دەبیستم کە چۆن بەو پەڕی نەرمییەوە لەگەڵماندا بە زمانی شیرین دەدوا ، رەحمەتی خواوەندی میهرەبانت لێبێت ئەی – ئۆزبیتش –ی خۆشەویست . هیوادارم لە لاپەڕەی نەمریدا جێگای خۆت گرتبیتەوە ، ماڵئاوا ، هەزار ماڵئاوا ئەی پەپوولەی نێو باغی بەهەشت. وتارەکە ئەو پەڕی داهێنان بوو ، ئەوانەی بیستییان هەموویان پێی دڵخۆش بوون ، بەڵام ئەوانەی مردووەکەیان بە چاکی دەناسی لەوەی ئەو لە وتارەکەیدا باسی کرد سەریان سوڕما. لە مە تێنەگەیشتن کە زابۆتین بۆچی ناوی مردووەکەی بەناوی – برۆکۆڤ ئۆزفیتش – دەبرد . ئینجا هەموویان دەزانن کە مردووەکە ژیانێکی تەواوی لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا بەسەر بردووە چۆن وتاربێژ دەڵێت بێوەمێرد بووە و تا مردن بەبێوەمێردی ماوەتەوە . ئەمانە هەموو لە لایەك و لە لایکی دیکەوەش مردووەکە بەردێنێکی سووری گەورە ناسرابوو و ناوبانگی بەڕدێن گەورە دەرکردبوو کە هیچ رۆژێك مووسی تراشینی

پێنەکەوتبوو چۆن وتاربێژ دەڵێت هەموو بەیانییان سەر لە زوو ردێنی خۆی دەتاشی .
لە دوای وتارەکە هێندەی پێنەچوو لە نێو خەڵکەکە پستەپست و چرپەچرپ پەیدا بوو .
سەیری – بۆلانسکی – کرد ، ئەویش پێی گوت :
– کاکی پرۆفیسۆر ئەوەی تۆ باست کرد زیندووه !
ئینجا نیمچە هاوارێکی بەسەردا کرد ، لێی پرسی :
– ئەی زانای ئاخر زەمان تۆ مەبەستت کێیە ؟
وتاربێژ گوتی :
– مەبەستم برۆکۆف ئۆزفیتشە کە لە نزیك گۆرەکە وەستاوە .
بولانسکی بەبێزارییەوە گوتی :
– کێ بە تۆی گوت ئۆزبیتش مردووە ؟ هەی دەبەنگی گەورە، ئەوەی مردووە بابلینۆفە .
ئەویش گوتی :
– بەڵام تۆ بەمنت گوت دەستپاك مردووە !
ئەمجارە بۆلانسکی تەواو جاڕس بوو ، هاوارێکی توندی بەسەردا کرد و گوتی :
– هەی کەر . بابلینۆف لە کاتی خۆیدا دەستپاکی لێژنەی ناوبژیوانان بوو ، بەڵام لە سەرەتای ئەمساڵەوە بۆ شوێنێکی دیکە گوێزرایەوە و پیاوێکی دی بەشێوە و سیمایەکی دی کە ناوی – ئۆبیتش – ە شوێنەکەی گرتووەتەوە .. ئینجا چۆن؟ وا دەزانیت فەرمانبەر تا دەمرێت لە یەك شوێن دەمێنێتەوە .

وتار بێژه گەمژەڵەکە هێشتا وەلامی بۆلانسکی نەدابووەوه کە ئۆزبیتش لێی نزیک بووەوه و چاوی لە دوڕچاوی نا ، پێی گوت :

– کاکی وتاربێژ .. دەزانیت لە دنیادا کەس لە تۆ کەرتر نیه.. چونکه بەم وتاره ماڵی منت کاول کرد کە گوتت بەرتیل وەرناگرێت ، کەواته تاکو ماوم کەس بۆ بەرتیل رووم تێناکات .

دەستپاك – محاسب

سەرچاوه

الحب

مەکسیم گۆرکی

# هـــــاورێ

زەنگی دەست لە کار هەڵگرتنی کرێکارەکان لە کارگەکە لێدرا ، لە ژوورەوە کۆمەڵەی مرۆڤ وەکو هەنگ جوولانەوە ، لە دەرگای سەرەکیی کارگەکە بە خێرا دەرچوون .
کرێکارە ماندووبووەکان دوای ئەوەی ئێش و کاری سەختی کارگەکە ژیانی رۆژێکیانی لوول دابوو و ئامێرە زەبەللاحەکان تەڕایی هێزی لەش و بازوویانی مژیبوو بەسەر شەقامی بەر دەرگای کارگەکە پەرش و بلاوبوونەوە و، هەرکە هەوای خاوێنی شاریان هەڵمژی سەر لە نوێ ژیانیان بەبەرەوە هاتەوە و ، لەش و لاری لەڕو لاوازی ماندوویان جوولەی تێکەوتەوە و ، هیوایەکی نوێ جارێکی دی لە دڵیان گەشایەوە ، رۆژە کارێکی سەختی پڕ لە ئێش و ئازار و دڵتەنگی تەواو بوو ، ئێستا دەگەڕێنەوە نێو ماڵ و منداڵەکانی خۆیان و ژەمێکی چاك لە خواردن دەخۆن و ، بۆ نێو چرە دووکەڵی مەیخانەکان غار دەدەن و ، حەز لە کاتی پشوودان دەکەن و چێژی لێوەردەگرن ، تا کاتی نیوەشەو دەمێنێنەوە و سەری خۆیان گەرم دەکەن و بەنێو شەقامەکاندا دەسووڕێنەوە و قسەی خۆش بۆ یەکدی دەکەن و، بەدەنگی بەرز پێدەکەنن و ، ئینجا بۆ نێو ماڵ و منداڵەکانی خۆیان دەگەڕێنمەوە ، کاتێ دەگەنەوە ماڵەوەش کەس رووی خۆشیان تێناکات وەکو ئەوەی لە ماڵی خۆیان

میوان بن ، ئیدی لە نێو قەرەوێلە شلوشۆقەکانی خۆیان پاڵدەدەنەوە و ، کۆمەڵێك جوێنی پیس بە ژنەکانی خۆیان دەدەن و هەموو جارێکیش سەرو گوێلاکیان بەچەپەلۆك دەکوتنەوە .

ئا ، ئەمە بوو ژیانی رۆژانەی خەڵکە کرێکارەکان ، (فلاسۆف)یش کە یەکێك بوو لەم کرێکارانە ، هەموو دەمێك دڵتەنگ و غەمگین دیار بوو ، چاو زەق و زەردەخەنەیەکی فێلبازانەی هەبوو ، فلاسۆف چاکترین وەستای قفڵ و کلیل بوو ، هەمیشە لە دێیەکەی خۆیشی بەبەهێزترین پیاویان دادەنا ، هەمیشە پیاوێکی زمان رەپ و رەفتار خراپ بوو ، بۆیە هەموویان رقیان لێ دەبووەوە و نەفرەتیان لێدەکرد ، ئەوانەی لە کارگەکە ئیشیان لەگەڵدا دەکرد ، خۆیان لێ دوورە پەرێز دەگرت و نەیاندەواند ، چاوەکانی شەڕیان لێدەباری ، دەست و بازووە بەهێزەکەی ترس و کردەوەی بەدیان دەنواند . لەبەر ئەمە کوڕی خۆی لێی بێزار بوو ، خێزانەکەی خۆی نەفرەتی لێدەکرد ، لەبەر نەگریسی ئەم پیاوە هەموو دەمێك ماڵەکەی ببووە گۆڕەبانی شەڕ و ئاژاوە. رۆژێکیان فلاسۆف نەخۆش کەوت و دکتۆری لادێی گەیشتێ، کەچی ئەم جانەوەرە دڕندەیە بەرانبەر نەخۆشییەکە سەری خۆی دانەنواند بەڵکو بەرووی دکتۆرەکەدا هەڵشاخا و گوتی :

(( ئەی نەگریسی هیچ و پووچ برۆ من ئەم مرۆڤە نیم کە لە مردن بترسێم )) .

بەیانی کاتێ زەنگی دەست بەکاربوونی کرێکاران لە کارگەکە لێیدایەوە ، کرێکارەکان لە خەو هەڵسان ، فلاسۆف دەمێك دەبوو هەناسەی لەبەر بڕا بوو . بەبێ کەسی لە نێو دارەبازەیەکی رەق و تەق درێژ کرابوو ، هەردوو لێوی وەکو تەڵەی تەقیو بەیەکەوە نووسابوو . نێو چاوان گرژ و رووترشییەکەی هێشتا پێوە دیاربوو ؛ لەدوای تەرمەکە خێزانی و ( باول )ی کوڕی و سەگە بچووکەکەی و یەکێك لە هاورێیەکانی مەیخانە و چەند بەڕەڵلا و سواڵکەرێکی گەڕەکەکە دەڕۆیشتن . کاتێ بە خاك سپاردیان و گۆڕەکەیان خۆڵەبان کرد و گەڕانەوە ، سەکە دڵسۆزەکەی لەوێ مایەوە و لە سەر گۆڕەکە وەکو توورگ دەیلووراند . کوڕەکەی ویستی دڵی دایکی خۆی بداتەوە ، رووی تێکردو بەبەزەییەوە گوتی :

– دایەگیان ؛ بەسە مەگری . بیر لە ژیانی ئێستای خۆمان بکەوە ، زۆر شتت لە باوکم قەبووڵ کرد ، ئازارێکی زۆرت بەدەستییەوە بینی ، ئایا هۆیەکەی دەزانیت ؟ باوکی بەستەزمانم کۆڵی ئێش و ژانی لەش و گیانی خۆی بەتۆدا دەڕشت ، بەراستی تابلێی ماندوو بوو ، سێ ساڵی رەبەق رەنجی کێشا ، کاتێ ئەو دەستی بە ئیش و کار کرد لەم شارۆچکە بێ بەختە تەنیا دوو کارگە هەبوو . کەچی ئێستا ژمارەی کارگەکان زۆر بووە و لە ژێر زەبری کاری سەختی لە رادەبەدەری ئەم کارگە زەبەللاحانە کرێکارێکی زۆر دەمرن .

کاتێ دایکەکە ئەمەی لە کوڕی خۆی بیست واقی وڕما . چاوەکانی پتر گەشبوونەوە ، ئیتر کورەکە لە دایکی خۆی نزیکبووەو ، خەریکبوو لە پرمەی گریان بدات و بەلام دانی بەخۆیەوە گرت و لە سەر خوان دانیشت . زێتر باسی خۆی کرد و ئەوەی لە دڵیدا بوو هەمووی بۆ دایکی خۆی هەڵڕشت. لەبەر ئەوەی هێشتا لاو و قوتابی بوو و دەبوایە شانازی بەو بیرو هۆشە تەڕو جۆش دراوەی خۆی بکات و لەم بیرو باوەڕە چڕو هیوایە گەورەیەش خودی خۆی دڵنیا بکاتەوە ، کەچی کاتێ کوڕەکە لە قسەکانی خۆی تەواو بوو سەری خۆی هەڵبڕی سەیری دایکی خۆی کرد بینی سیمای هەڵبزرکاوە و هەردوو کاسەی چاوەکانی بوونەتە گۆمی فرمێسك .

دایکەکە بە ناچاری وەکو بڵێی حەز بە بیستنی شتی نوێ بکات گوێی بۆ کوڕەکەی خۆی شل کرد . کوڕەکە درێژەی بە قسەکەی خۆی دا و بەدایکی خۆی گوت :

– پێم بڵێ خۆشی چیە ؟ .. چی لێ دەزانیت ؟ .. چ هیوایەکت بە ژیان ماوە ؟

دایکی بەخەفەتەوە سەری خۆی بۆ لەقاندەوە ، هەستی کرد شتێکی شاراوە ڕێگای هۆشی گرتووە و ناهێڵێت بەچاکی بیر لەم مەسەلە زیندەگییە بکاتەوە . دڵی لەرزی ، ئەمە یەکەمین جار بوو لە ژیانی خۆیدا کە شتی لەم بابەتانەی گوێ لێدەبێت ، باس لە ژیانی خۆی بکات ، باس لە خۆشی ئاییندەی بکات ، باس لە ئێش و ئازاری خەڵکی هەژار و بێ

دەسەڵات بکات ، بۆیە ئەم باسە لە تاریکاییەکی خەستی ژیاندا هۆشیاری کردەوە ، رق و کینە و دڵڕەقییەکی توندی لەلادا خوڵقاند . رق و کینە و بێزاری بەرانبەر ئەو دەست کورتییە و بێ هیواییەی سەردەمی لاوێتی مێردی خۆی ، سەردەمی لاوێتی ئێستای کوڕەکەی خۆی ، سەردەمی جوانی و نازداری خودی خۆی .. ئایندەی منداڵەکانی دیکەی.. ورەیەك ، هیوایەك ، هەموو دەمارەکانی لەشی بە جۆش هێنا ... وەستانێکی مەردانە لە رووی ستەم و ، زۆرداری و ، بارگرانی ژیانی ئێستایان .

دایککە لەگەڵ دراوسێیەکانی خۆی دەستی بە باسی ژیان کرد . بەڵکو لە هەموو رووێکەوە باسی ژیانی دەکرد و هەرگیز گلەیی لەوە نەدەکردەوە کە ئەوان بێ دەسەڵاتن . کەس نەیدەتوانی باسی ئەوەی بۆ بکات کە ئەم ژیانەیان لە بەرچی وا سەخت و ناخۆشە و بەشی ئەوان هەمیشە ماندووبوون و ئارەق ڕشتنە ؟ ئێستا کوڕەکەی خۆی دێت و باسی ژیان و رەنج بەخەساری بۆ دەکات .

کاتێ ئەم باسانەی بۆ دەکرد ، دڵی لە نێو قەفەسەی سنگیدا لێی نەدەدا . گوێی لێدەگرت ، سەیری هەردوو چاوو سیمای دەکرد ، لە ناخی خۆی هەستی بەسەربەرزی کرد کە کوڕەکەی خۆی چۆن وەکو شاعیرێکی ئاوارەی دوورە وڵات باس لە ژیانی پڕ لە کۆڵەمەرگی خەڵکی بێ بەختی وڵاتەکەی خۆی دەکات ، باس لە ئاوات و ئایندەی رووناکی گەلەکەی خۆی دەکات .

دایکەکە زوو بە زوو وەڵامی دایەوە ، پێی گوت :

- باشە ، کوڕی خۆم تۆ دەتەوێت چی بکەیت ؟

- دەمەوێت شت فێربم و ، خەڵکیش فێر بکەم : ئێمەی کریکار پێویستە ئەمانە بزانین و فێریان ببین . پێویستە لەسەرمان ئەمە چاك تێبگەین کە ئەم ژیانەی ئێمە ، کە چەند ساڵێکی کەم دەژین ، پێشتر خۆش و ساکار بوو ، پێشتر بە سادەیی و شادی دەژیاین ، بۆچی ؟ لەبەرچی ئەم ژیانەی ئێمەیان ، ژیانی ئێمەی کرێکاریان وا سەخت و گران کردووە؟

دایکەکە زەردەخەنەیەکی نەرمی بۆ کرد ، ئەگەر چی هێشتا تەراپی رێچکەی فرمێسکی نا ئومێدی بەسەر هەردوو روومەتییەوە دیاربوو ، شانازی بە قسەکانی کوڕەکەی خۆی کرد ، کە ریگایەکی راستی گرتووە و خەڵکی بێ ئاگا بە ئاگا دێنێتەوە و ، بۆ لاوێتی کوڕەکەی خۆیشی خەفەتی دەخوارد کە ئەم کوڕە نازدارەی ژیانی خۆی لە پێناو بەدیهێنانی ژیانی پڕ لە کامەرانی بۆ خەڵکی سادە بەخت دەکات . بەڵکو بەتەنیا و لەگەڵ چەند کەسانێکی جحێڵی وەکو خۆی ، ملیان لەبە ئەم ژیانە پڕ لە کۆیلەییە ناوە کە هەموو کەس، خەڵك بەگشتی لێی راهاتوون .

ویستی بە کورەکەی خۆی بڵێت ، کوڕی شیرینم ئەم خەڵکە هەم نەخوێندەوارە و هەم نەفامە لە ژێر پێچکەی رەورەوەی جەماوەری خۆویست و کورت بین دەپلشێنێتەوە و لەبەر بڵێسەی گەرمی دروشمە بێ ناوەرۆکەکان دەتوێتەوە و

شوێنەوارت نامێنێت و خودت لە بووندا دەسڕێتەوە ، بەڵام نەیویست نیگەرانی و نارەحەتی دڵی خۆی بۆ کوڕەکەی خۆی ئاشکرا بکات و یا ئەوەتا کوڕەکەی خۆی سارد بکاتەوە، بەهەرحاڵ بیرو باوەڕەکە دڵخۆش بوو و ئەو رۆژە کورەکەی خۆی بە پیاوێکی مەزنی تێر عەقڵ دەهاتە بەرچاو.
باول سەیری دایکی خۆی کرد زەردەخەنەی بە لێوەوە بوو ، هەستی خۆی بۆ راگرتووە و چاوی لێناترووکێنێ ، چاوەکانی پڕ خۆشەویستی بوون ، بەمەش تێگەیی کە توانیویەتی باوەڕ بە دایکی خۆی بێنێ ، بۆیە هەستی بەکامەرانی کرد کە توانای ئەوەی هەیە خەڵکی بەرانبەر خۆی بڕواپێبێنێت .
ئیدی رووی لە دایکی خۆی کرد و باسی ئەو کەسانەی بۆ کرد کە وەکو ئەو باوەڕیان بە ژیانی پڕ لە کامەرانی خەڵك هەیە ، کەچی دوژمنانی ژیان وەکو دڕندە بەدوایانەوەن ، لە تاریکایی بەندیخانەکانیان دەپەرستن و ، بۆ ناوچە سەهۆڵبەندە هەرە دوورەکانی وڵاتیان دەربەدەر دەکەن و سەرەڕای سزادانیشیان ناخۆشترین و گرانترین کاریان پێدەکەن .
دایکەکە ماوەیەکی تەواو بێ دەنگ بوو ، ئینجا وەکو پاڕانەوە پێی گوت :
– کوڕی خۆم ، دەزانم خۆت بەفەتارەت دەبەیت !
باولیشی لە ژوورەکە لە پێش دایکی خۆی دەهاتو و دەچوو و دەیگوت :

– ئێستا تێم گەیاندوویت کە نیازم چیە ! ئەی دایکی شیرینم دەستم دامێنت ئەگەر بەراستی منت خۆش دەوێت لە رێگای ئاواتم مەبە کۆسپ . لەم کاتە دایکەکە لە پرمەی گریانی دا و گوتی :

– ئازیزەکەم ئەوەی راستی بێت زۆر حەزم دەکرد لەم کەینوبەینەی تۆ دەیکەیت هیچم نەزانیبووایە .

چەند رۆژ و مانگ تێپەرین ، هەڵسوکەوتی باول پتر رێکوپێکی نواند ، دۆست و برادەر پتر هامشۆیان کرد ، ئیتر شتی نوێ هاتە گۆرێ ، کورەکە لە کارگە چەندین هاورێی نوێی دیکەی پەیدا کرد ، رۆژانی یەکشەممە کە رۆژی پشوودان بوو لە ماڵی خۆی لەگەڵ هاورێیکان کۆدەبوونەوە.. هاورێیەکیان سەیری کتێبێکی کرد ، پرسی:

– ئەم کتێبە چیە ؟ باول لە وەڵامدا گوتی :

– ئەمە باسی جیولۆجیا دەکات . هاورێیەکیان گوتی :

– ئێمە پێویستیمان بەم جۆرە کتێبانە نیە . چونکە لە لای جوتیاردا گرنگ نیە کە بزانێت خاکی گۆی زەوی پێشتر چۆن بووە و دواتریش چۆن دەبێت . هەروەها لە لای ئەودا گرنگ نیە کە بزانێت زەوی لە شوێنی خۆیدا وەستا بێت یا بەدەوری خۆیدا بسوورێتەوە ، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە بزانێت ئەم زەوییە تا چ رادەیەك پارووی نانی زاری خۆی و ماڵ و منداڵەکەی خۆی لێپەیدا دەکات ، هاورێیەکی دیکەیان پرسی:

– ئەی ئەم کتێبە باسی چی دەکات ؟ باسی ئێمە دەکات ؟
باول لە وەڵامدا گوتی :
– بەڵێ ، لەمەدا شتێك دەربارەی باروِدۆخی کۆیلەیی فێر دەبیت ، هاوڕێیەکە کتێبەکەی لە شوێنی خۆی دانایەوە و گوتی :
– ئەم کتێبەش هێندە گرنگ نیە و پێویست ناکات مێژووی هەموو خەڵکی دنیا بزانین .
لێرەدا باول لە هاوڕێیەکەی پرسی : ئایا تۆ زەویت هەیە ؟
– بەڵێ ، ئێمە بە سێ برایان ، یەك پارچە زەویمان هەیە و ، بەلام زەوییەکە گشتی چەوە و چەوەکەی بۆ خاوێنکردنەوەی تەشت و مەنجەڵی زیو باشە ، زەوییەکە هیچ بەرهەمی نیە و ، بەبەیاری بەجێمان هێشتووەتەوە .
– بەلام تۆ بەتواناى ! جوتیار هیچ ولاتێکی تایبەتمەندی خۆی نیە ، ئیمڕۆ لێرە خاوەن زەوییە و سبەی لە شوێنێکی دیکە دەبێتە خاوەن زەوی ، ماڵ و منداڵیشی ناتوانن لەگەڵیدا لە سەر زەوییەکی دیاریکراو بمێنێنەوە ، هەموو ئاواتی جوتیار ئەوەیە ژیانی رۆژانەی ماڵ و منداڵەکەی چاك بکرێت بێ ئەوەی لە سەر زەوییە دیاریکراوەکە دوور بخرێتەوە .
ئیدی هێندەی پێنەچوو هەر لەم گفتوگۆیانەدا بوون کە دەستیان بە گوتنی سروودی نیشتمانی کرد ، هەموویان پێکەوە دەنگی خۆیان بەرز کردەوە ، لە شوێنە بچووکەکە دەنگیان سەدای دەدایەوە ، یەکێکیان بەهاوار گوتی :

- دەی ، زوو کەن ، با بچینە سەر شەقام تاکو خەڵکی دی لەگەڵ ئێمە سروودەکە بڵێنەوە . پێشنیارەکەی هاوڕێی خۆیان پێخۆشبوو ، چوونە سەر شەقام و ، ریز بوون و ، دەستییان لە مل یەکدی کرد و هەموویان بە هەڵپەڕین سروودە نیشتمانییەکەیان دەگوت .

یەکی دی گوتی :

- هاوڕێیان پێویستە ئێمە نامە بۆ کرێکارانی فەرەنسا و ئینگلتەرا و ئەڵمانیا بنووسین ، تاکو لەم چالاکییەی خۆمان ئاگاداریان بکەینەوە کە لە رووسیای ولاتی ئێمەش برایان هەیە و ئێمەش وەکو ئەوان هەمان بیروڕامان هەیە و ، وەکو ئەوان چالاکیمان هەیە و ، ئێمەش وەکو ئەوان لە پێناو هەمان ئامانج تێدەکۆشین و بۆ هەمان بیروباوەڕ خۆمان بەخت دەکەین و بەسەرکەوتنی ئەوان سەرکوتووین و بەهەژاری و نەبوونی ئەوانیش دەست کورت و ماڵ وێرانین. هاواریان دەکرد ، سەری خۆیان پتر بەرز دەکردەوە ، بیریان لە هاوڕێیانی ئینگلیز و فەرەنسی و ئەڵمانی و ئیتالی کردەوە ، دەنگیان گەیشتە سەرجم کرێکارانی جیهان وەکو بڵێی هاوڕێ یا برای یەک دایك و باوك بن .

دایکی باوك لە دوورەوە گوێی خۆی بۆ هەڵخستبوون ، بەسەرسامییەوە سەیری ڕێپێوانەکەی سەر شەقامی دەکرد و پرسی :

– ئەمانە چ جۆر پیاوێکی مەردن ، ئایا هەموویان هاوڕێن؟

لاوەکان وەڵامیان دایەوە :

– بەڵێ ئەی دایکی بەڕێز ، ئێمە هاوڕێی خۆشەویست و دڵسۆزمان هەیە ، هەمیشە دوژمنی دڕەندەشمان هەیە ، ئێمە گشتمان ڕۆڵەی یەك دایکین ، ئەویش زەوییە .

هێشتا دەمێك بوو پەژیبوونە سەر شەقام و سروودی نیشتمانییان دەگوت ، هاواری برایەتی و یەکێتی نێوەندەکەی هێنابووە هەژان . ئالایەکی جوان و ڕەنگینیان بەرز کردبووەوە ، دروشمی خۆیان تێدا ڕەنگ کردبوو . خەڵك زوو بەزوو بەدەوری گەنجەکان گرد بوونەوە . کۆمەڵەکە ووردە وردە دەستی بەڕۆیشتن کرد . ڕێپێوانێکی گەورە دەستپێکرد ، خەڵك زێتر لێیان نزیکبوونەوە ، گوێیان لە دروشمەکانیان دەگرت ، لەم کاتەش ئالاکەیان لە نێو ئاپۆرایەکە دەشەکایەوە ، خەڵکی دی پارێزگاری ئالاکەیان دەکرد ، دەنگی هاواری برایەتی و یەکێتی بەرەیەکی توند و ئەستووری دروستکرد . تیپی پۆلیسە کرێگرتەکان بەداران کوتنە وێزەیان . هاوار هاواری جوتیار و کرێکار و گەنجەکان گوێی ئاسمانی دەتاساند . پۆلیسەکان ترسان و دەستیان بەتەقە کرد . لاوەکان گشتیان گیران ، نێو شەقام

چۆل بوو .. خەڵکەکە رایان کردو خۆیان شاردەوە ، هەندێ کەس لە پەنا پەسێو و سەرە گەڕەکە باریکەکان مابوونەوە .. بەغەم و پەژارەوە سەیری دایکی باولیان دەکرد ، دایکەکەش بەمات و مەلوولی بەرەوماڵەوە گەڕایەوە کە لە نێو چوار دیواری چەشنی زیندانـدا ، بۆ بەخت رەشی خۆی و کوڕەکەی خۆی ، هەتا دەمرێت فرمێسك برێژێت .

سەرچاوە

- الحب -

مەکسیم گۆرکی

## کەسەکـــــــان

**خاتـوو** : ئافرەتێکی تەمەن نزیك پەنجا ساڵەی خانەدانە

**سیمـۆن** : کچێکی بچکۆلانەی کارەکەرە

**ئامـۆ** : خەباتگێرێکی هێزی نیشتمانی فەرەنسایە

**عەریف** : عەریفێکی لەشکری ئەڵمانیای داگیر کەرە .

**دیمەن** : دێیەکی فرەنسایە

**کـــات** : ماوەی دووەمین جەنگی جیهانیە ، ئەڵمانیای هیتلەری نیوەی خاکی فەرەنسای داگیر کردووە ، ئەو دێیەش لە ناوچە داگیر کراوەکانە .

## (( شانۆگەری پێنووسی پوورم ))

( خاتوونی ماڵەوە لە ژووری میوانان دانیشتووە )

سیمۆن : نزیك دەبێتەوە ، ئای خاتوو !

خاتوو : چ بووە !

سیمۆن : خاتوو بینیت ؟

خاتوو : سیمۆن دەڵێی چی ؟

سیمۆن : بەڵام خاتووی بەڕێز

خاتوو : سیمۆن لەوانەیە ئەمە سەردەمی دڕندان بێت ، بەڵام لە چوارچێوەی ئەم خانووەدا ناهێڵم شتی وا رووبدات .

سیمۆن : بەڵام خاتوو وا گەیشتنە ئێرە !

خاتوو : ( بێدەنگی دەکات ) سیمۆن لەوانەیە فەرەنسا بەتەواوی داگیر بکرێت بەڵام نەتەوەیەکی ئازاد و لە رووی نەژادیشەوە ڕەسەن بێت هەرگیز نابەزێت ، ئەگەر لاریت نەبێت پێویستە رەوشت بەرزیمان بپارێزین و بەشێوەیەکی شارستانانە لەگەڵ ئەو بارودۆخە نوێیەدا بەڕێوە بچین .

سیمۆن : بەڵێ خاتووی بەڕێز .

خاتوو : سوپاس بۆ خوا ئێمە تا ئێستا خاوەنی یەك شتی گرینگین ئەویش رەوشت بەرزی و هەڵسوکەوتی رێکوپێکمانە کەچی دوژمن لەمە بێبەشە و هیچ رۆژێکیش رەوشتی چاکی نەبووە ئەو شتەش ناکرێ لێمان زەوت بکرێت.

سیمۆن : بەڵێ هەرگیز ناتوانن .

خاتوو : فەرموو دەرگاکە بکەوە بە ژووری دووەمدا برۆ دەرەوە .

سیمۆن : ئای خاتوو دەمویست شتێکت پێبڵێم .

خاتوو : دەرگاکە بکەوە و لە دوای خۆت دایخەوە بە ئەسپایی وەرە پێشەوە چیت هەیە پێم بڵێ .

( سیمۆن بەپەلە دەچێتە دەرەوە ، دەرگاکە گاڵە دەدات ، دیسان بە دیار دەکەوێتەوە ، دەرگاکە لە دوای خۆی دادەخاتەوە ، لە ناو ژوورەکە دوو هەنگاو دەڕوات ، ئینجا راوەدەستێت ) بەڵێ سیمۆن ؟

سیمۆن : وابزانم قسەمان پێناکرێت ، چونکە ئەوانە ئێستە دەگەنە ئێرە .

خاتوو : ئەوانە کێن ؟

سیمۆن : ئەو سەربازانەی لە شەقام هاتوچۆیان دەکرد .

خاتوو : کەواتە هاتوچۆکردنی ئەم سەربازانە لە ماوەی دواییدا لەسەر شەقامەکانی ئەم ناوچەیە شتێکی ئاسایی نەبووە .

سیمۆن : ( بەرەو پەنجەرە هەنگاو دەنێت ) نەخێر خاتووی بەڕێز ئەمانە دوو سەربازن و لە ناو ئۆتۆمبێلێکی سەربازین و هاولاتییەکی شارستانیشیان لەگەڵدایە .

خاتوو : شارستانەکە کێیە ؟

سیمۆن : پیاوێکی نامۆیە خاتووی بەڕێز .

خاتوو : پیاوی نامۆ ؟ سەیری سەربازەکان بکە بزانە لە شەڕکەرەکانن ؟

سیمۆن : نەخێر ، ئەوانەی دڕندەکانی کارگێڕین ، سەیرکە وەستاون وا خەریکن دادەبەزن .

خاتوو : لە پەنجەرە نزیك دەکەوێتەوە . بەڵێ نامۆیە ، سیمۆن ئایە تۆ ئەم کابرایە دەناسیت ؟

سیمۆن : ئەم کابرایەم پێشتر نەبینیوە خاتووی بەرێز .

خاتوو : ئایا ئەگەر خەڵکی ئەم ناوچەیە بووایە دەتناسی ؟

سیمۆن : بەڵێ خاتوو من هەموو کەسێکی ئەم نێوەندەی نێوان ئێرەو ناوچەی گوندی ( ستیڤی پیرۆز ) دەناسم .

خاتوو : ( بەدەنگی نزم ) بێگومان .

سیمۆن : ئای خوایە رەحمت بێ ، وا خەریکن دێنە ژوورەوە.

خاتوو : خۆشەویستەکەم خۆت مەشێوێنە .

سیمۆن : بەڵام لە زەنگ دەدەن و منیش ..

خاتوو : بەشێوەیەك هەڵسوکەوت دەکەیت وەك بڵێی لەبەر دەستی . سەرۆکێکی گەورەی کارکەران و لەگەڵ دەیان خزمەتکار ئیشت کردبێت . وەك کەسێتییەك رەفتار دەکەیت! نەك وەك کچی رەژوورکەرێك ( خاتوو ئەم رستانە بەورەیەکی بەرزەوە دەڵێت و لەگەڵدا هەستی دڵسۆزیشی نابزوێت ) لەسەر تۆ پێویستە هێمن بیت و بەشێوەیەکی رێکوپێك بجولێیتەوە .

سیمۆن : هێمن بم خاتوو هێمن ، ناو دەروونیشم چەشنی دۆزەخ بکوڵێت !

خاتوو : خزمەتچی باش ، پێویستە دەروون والا بێت ، هەر ئەوەندەشم مەبەستە رووت گرژ نەبێت و لەسەر خۆبیت .
بڕوا بکە لەوانەی لە دەرەوە وەستاون شوێنی تۆ پتر لەم جێگەیەدا هەیە ، ورەت نەرووخێت ، نەختێك ئازابە .
سیمۆن : خاتوو ، ئەمانە لە دەرگایان نەداو یەکسەر هاتنە ژوورەوە .
خاتوو : ( بە بێزارییەوە ) بەڵێ ئەوانە دڕەندەی سەردەمی بیستەمن ماوەیەکی زۆرە زەنگلێدانی دەرگای مالانیان لە بیر چووەتەوە ( دەرگا دەکرێتەوە ) .
نامۆ : ( بەدەنگی نەرم و بڕواوە ) ئای ، تۆی پووری خۆشەویستم ، کەواتە من زۆر بەختەوەرم ، فەرموو ئەی هاورێم فەرموو وەرە ژوورەوە . پووری بەرێزم ئەو عەریفە منی گرتووە و داوای ناسنامەم لێدەکات !
خاتوو : ( بەپێ پەروا ) من دەیناسم ؟
عەریف : ئەو کابرایەمان لەم دارستانەی نزیك کۆشکی ئێوە دەستگیر کردووە .
نامۆ : عەریف مەبەستی وایە نابێت کەس لە نێو دارستاندا هاتوچۆ بکات .
عەریف : هیچ پێناسەی هەڵنەگرتووە .
نامۆ : پێم گوتووە ئەو رۆژانە ئەگەر خەڵك هەموو پێناسەکانی خۆی لە باخەڵی دواوە هەڵبگرێت ، ئەوا ناتوانن بۆ پێشەوە بچەمێنەوە ، ئەگینا دەبێت جۆرکێك بۆ خۆیان دروست بکن و بەملی خۆیانەوە شۆڕ بکەنەوە .

عەریف : دەڵێت برازای تۆیە خاتووی بەڕێز ، بەڵام ئێمە بڕوامان پێنەکردووە ، بۆیە بۆ ئێرەمان هێناوە .
( ماوەیەکی کورتی نزیك دەقیقەیێك بە گشتی بێدەنگ دەبن)
خاتوو : بەڵێ برازامە .
عەریف : بەڕاستی !
خاتوو : دڵنیابە .
عەریف : ئایە لێرە دەژیت ؟
خاتوو : ( بەسەر بەرزییەوە ) بەڵێ لەگەڵ ئێمەدا دەژیت !
عەریف : کەواتە ( وەك بیەوێت درێژە بەقسەکە بدات ) داوای لێبووردن دەکەم خاتووی بەڕێز ، بەڵام لەو باوەڕەدایت سیمای ئەم لاوە لە بەرژەوندی ئەودا بێت .
خاتوو : بەداخەوە ئەی عەریف ، برازای من لە نەوەی ئەو سەردەمەیە کە بایەخ بەسەروسیمای خۆیان نادەن ، وەك بزانم ئەوانە پێیان دەڵێن ( هەست بە خۆکردن ) .
عەریف : ( بە قێزکردنەوە ) بێگومان خاتووی بەڕێز .
خاتوو : ئەوانەی بەچاوی سووك سەیری دابونەریتی کۆمەڵ دەکەن ، قەرەوێت بەستن لە لای ئەمانە کەمکردنەوەیە بە سەربەستی کەسێتی ، یاساش دانەمەزراوە کە سەربەستان پەیڕەوی بکەن .
عەریف : بەڵێ خاتوو ، برازای تۆ ئەگەر نەختێك دابونەریت و یاسای گشتی کۆمەڵی پەیڕەو بکردایە ئیمڕۆ ئێمە وڵاتی ئێوەمان پێداگیر نەدەکرا .

نامۆ : ئایه تۆ بەو قەرەوێت بەستنەت لەو باوەڕدایت ولاتی ئێمەت بە زاندبێت ؟ ئەی عەریف تۆ خۆت له خشته بردووه ، قەرەوێت بەستن ژانه سەری توندی بەدوایەوەیه .

خاتوو : ( دەنگێك له شێوەی فرمان ) تکایه ئەی کوڕی خۆشەویستم مەهێلن بچینه نێو مەسەله تایبەتییەکانەوه .

نامۆ : مەسەلەکه تایبەتی تێدا نیه ، ئەی پووری دڵگیرم بەڵام من زانیومه که قەرەوێت بەستن ، ناهێڵێت خوێنی پاگژ بچێته نێو کاسەی سەرو شانەکانی مێشك ناتوانن کاری ئاسایی خۆیان بکەن ، من رایەکم هەیه .

عەریف : گەورەم .. بیروڕای تۆ بۆ من سوودی نیه .

نامۆ : ( دوای نەختێك بێدەنگی و بیرکردنەوه ) تێگەیشتم سەرکەوتووان ئەوانەن قەرەوێت لەمل دەکەن و له شوێنی بەرز دادەنیشن ، دۆڕاوەکانیش ئەوانەن له دارستان پیاسه دەکەن ، بەلام بە رای تۆ کێ بەختەوەره ؟ پێم بڵێ ئەی عەریف ، ئایا هیچ رۆژێك حەزت لەوه نەکردووه پیاسەی نێو دارستانێك بکەیت .

عەریف : گەورەم من حەز له یەك شت دەکەم ، ئەویش ئەوەیه سەیری پێناسەکەت بکەم !

نامۆ : ( دەیەوێت کات پتر بەسەر ببات ) پێناسەی من ؟

خاتوو : بەلام ئەی عەریف ئەوه پێویسته ؟ من ئێستا پێم گوتیت که ..

عەریف : من دڵنیام که خاتوو لەگەل دەسەلاتداراندا هاوکاره پایه و پلەیەکی بەرزی هەیه .

خاتوو : کەواتە لەو حاڵەتە !

عەریف : بەڵام کەشتێك دەستپێدەکەین ، پێویستە تەواوی بکەین . لە مەسەلەی ناسنامەی برازاتیش هێشتە تەواومان نەکردووە .

خاتوو : ئایە دان بەوەدا دەنێیت کە من لە لای ئێوەدا پایە و پلەی بەرزم هەیە .

عەریف : بەڵێ من گوێم لێبووە ، خاتووی بەرێز .

خاتوو : کەواتە لەو داواکارییەت منیش دەتوانم رۆڵم هەبێت چونکە ئەوەی تۆ بەرانبەر برازام دەیکەیت بەدەستدرێژی دەزانم .

عەریف : نەخێر خاتووی بەرێز ئەمە تەنیا مەسەلەیەکی رۆتینە و هیچی دیکە نیە .

نامۆ : ( لەبەر خۆیەوە ) رۆتین ئەو خواوەندە مەزنەیە .

خاتوو : پرسیار کردن لە ناسنامەی برازام کارێکی رۆتینە و بەڵام ڕشت بوون لەسەر بینینی دەفتەری ناسنامەکە دەرچوونە لە رەوشتی ئاسایی سەربازی ، بۆ ئەمەش راپۆرتێکت لەسەر دەنووسم و تێیدا سەرۆکت لەم مەسەلەیە ئاگادار دەکەمەوە .

عەریف : زۆر چاکە خاتووی بەرێز ، ئەو کاتە دەتوانم سەیری ناسنامەی برازات بکەم .

خاتوو : چی دەڵێیت ئەگەر من ...

نامۆ : ( بە ئەسپایی ) خۆشەویست ، وا چاکە مەسەلەکە ببڕێتەوە ، ئەوانە کاتیان لە لادا گرنگ نیە !

ئەگەر عەریف بڕیاری داوە ناسنامەی من ببینێت ( بەرەو دەرگا دەڕوات ) لە باخەڵی پاڵتۆکەم بەجێم هێشتووە .

سیمۆن : ( لە دواوە بە دەنگی بەرز ) توخوا نەڵێی لە ناو پاڵتۆیە کەتانیەکەیە !

نامۆ : ( بە دوو دڵیەوە ) بەڵێ ، لەبەرچی ؟

سیمۆن : ( پتر نیگەران دەبێت ) ئەو پاڵتۆیە کتانیە رنگ شیرییەکەی دوێنێ لەبەرت کردبوو ؟

نامۆ : بێگومان .

سیمۆن : خودایە ئەوەمان لەگەڵدا نەکەیت ، پاڵتۆکەم بۆ شۆرینگە ناردووە !

نامۆ : شۆرینگە !

سیمۆن : بەڵێ گەورەم ئەو بەیانیە رەوانەم کردوون ، ئەگەر هێشتا لە ناو سەبەتەکە نەبێت .

نامۆ : ( بە نەختێك تووڕە بوونەوە ) پاڵتۆی منت ناردووەتە شۆرینگە ناسنامەکانیشی بە گشتی تێدایە ..

سیمۆن : ( بەپاکانەوە ) نەمزانیوە ناسنامەکانی تێدا بووبێت .

نامۆ : چۆن هەستت بە نیو تەن کاغەزی بەڵگەنامە نەکردووە، ناسنامەی کەسێتی ، پسوولەی خۆراك ، پسوولەی خواردنەوە ، بەڵگەنامەی هاتوچۆ ، بەڵگەنامەی لێبووردن لە سوپا ، پسوولەی پۆشینی جلوبەرگی مەدەنی ، پسوولەی میوانداری دەمیل بۆ رۆژئاوا و دەمیلیش بۆ رۆژهەڵات ، پسوولەی ..

سیمۆن : ( بەتووڕەیی و هەڵچوونەوە ) چۆن بزانم پاڵتۆکەت گرانە لەگەڵ جلی دیکە لەسەر زەوی دانرا بوون .

نامۆ : ( هاوار دەکا و سەری سیمۆن دەگرێت پاڵتۆکەم لەسەر کورسی دانا بوو .

سیمۆن : نەخێر ، لەگەڵ جلی دیکە لەسەر زەوی بوون .

سیمۆن : لەگەڵ کراسی پیس و چەرچەف و پەشتەماڵی گەرما و لە سەر زەوی کەوتبوون ، گشتیانم بەیەك ئامێز هەڵگرت و خستمنە نێو سەبەتەکەوە .

نامۆ : پێم گوتی پاڵتۆیەکە لەسەر کورسی بوو زۆر خاوێنیش بوو پێویستی بە شۆرین نەدەکرد پێش دوو هەفتە خۆم بە دیوارم هەڵواسیبوو .

خاتوو : کوڕی خۆشەویستم ، ئەو مشتومڕە سوودی نیە ، ئێستا ئیشەکە لە دەست چووە ، بەهەر شێوەیەك بێت کرێکارانی شۆرینگە ناسنامە و پسوولەکانت دەدنەوە و بەیانی دەیانهێننەوە .

نامۆ : ئەگەر نەیاندزن ، چونکە خەڵکێکی زۆر هەن دەیانەوێت ئەم بەڵگەنامانە بدزن .

خاتوو : ( بەدڵنیاییەوە ) ئای نەخێر مام (فلۆرۆ) کەلوپەلی خەڵکی لە لادا گرنگە ، نیگەران مەبە ، بەیانی بەڵگەنامەکانت بەگشتی بۆ دێنێتەوە ، ئەو کات دەبینی چۆن بۆ نووسینگەی سەربازییان ڕەوانە دەکەین تا عەریفی بەڕێز چاك سەیریان بکات . تەنیا ئەگەر عەریف ئەو کاتەش داوای خودی تۆ نەکات .

عەریف : ( بەساردی و بێزارییەوە ) تۆی بەڕێزم بینی ، کە هاتەوە تەنیا ناسنامەکەم دەوێت .

نامۆ : عەریف ، ئەم نیو تەنە بەڵگەنامانە دەبینیت ئەو کاتیش بە ئارەزووی خۆت سەیریان دەکەیت ، ئەمە ئەگەر لە شۆڕینگە بۆمان بگەڕێننەوە چونکە ئەم گەمژەڵە بچکۆلەیە کارێکی ناڕێکی لەگەڵدا کردووین .

خاتوو : ( بە فیزەوە ) هیچ مەترسە ، پێویستیش ناکات سیمۆن سەرکۆنە بکەیت ، سیمۆن کچێکی چاکە و بۆ ئیشەکانی خۆی دڵسۆزە .

سیمۆن : بەڵێ دەبوایە سەیری باغەڵەکانیم بکردایە .

خاتوو : ئەگەر دەتوانیت عەریف تا دەرەوە ببەت .

سیمۆن : ( بەجوولانەوەیەکی خانەدانەوە ) خۆی شارەزایە (لەگەڵیدا ڕێگاشی پێ نیشان دەدات ) خاتووی بەڕێز .

خاتوو : ئەی عەریف لەمەودوا هەوڵ بدە ئیش و کارەکانت پتر ڕێکوپێك بن ، چونکە ڕۆڵەکانی ولاتی ئێمە پتر ڕێز لە ڕەوشت دەگرن نەك یاسا .

عەریف : من ئامۆژگاری خۆم هەیە ، بەپێی ئەم ئامۆژگارییانە ئیشوکارەکانم جێبەجێ دەکەم ، ڕۆژتان باش.

خاتوو : ڕۆژتان باش گەورەم ( عەریف دەچێتە دەرەوە و سیمۆنیش بەدوایەوە دەردەچێت و دەرگاکە دادەخات ، دەقیقەیەك بێدەنگی ) .

نامۆ : شادمانم بەو هەڵسوکەوتە بە پەلەیەی تۆ ، پێم بڵێ چۆن هاولاتییەکی و چۆن لایەنگری دەسەلاتدارانیشی ؟

خاتوو : كوره لاو دانيشه ، شتێكت دەدمێ بيخۆرەوە ، وابزانم ئەژنۆكانت زۆر ماندوون .

نامۆ : ئەژنۆكانم ماندوون و سكيشم بەتاڵە

خاتوو : ( نەختێك مەى لە پەرداخێك دەكات پێشكەشى دەكات ) مەيەكە هێز و توانات بەبەردا دێنێتەوە .

نامۆ : تۆش ناخۆيتەوە ؟

خاتوو : نەخێر سوپاس .

نامۆ : بەڵێ ديارە لەگەڵ خەڵكى بيانيدا ناخۆيتەوە ، لەڕاستيدا ئێستە كاتێكى لەبار نيه مەى تێدا بخورێتەوە ، بەهەر حاڵ من مەى هاوكارانى داگير كەران دەخۆمەوە (مەى دەخواتەوە ) پێم بڵێ خاتووى بەڕێز بەيانى كە ئەوانە دەزانن تۆ برازات نيه چ روو دەدات ؟

خاتوو : ( بەسەرسوڕمانەوە ) بەڵام بەراستى برازاكەم هەيە ، ئەم مەسەلەيەى تۆش هاوڕێى بەڕێز ئەگەر درۆى تێدايە بەڵام درۆيەكە سوود و بەرژەوەندى گەلەكەمانى تێدايە ، برازايەكى رۆح سووكم هەيە ، لە شار بێزار بووە و ئێستا بۆ سەردان چووەتە ( بۆنيفال ) .

نامۆ : چ جۆرە بێزارييەكە ! بۆچى بۆ نيفال بە هەشتە .

خاتوو : ( بەساردييەوە ) زۆرى حەز لە قسەيە و لێرەش كەس گوێى لىَ راناگرێت لە ( بۆنيفال) خەڵكى وا هەيە بە قسەكانى هەڵدەپەڕن .

نامۆ : ( لە مەبەستى خاتوو دەگات ) ئاى ..

خاتوو : بڕوای بە برایەتی نێو نەوەی ئادەمیزاد هەیە ، ئەگەر ئەو ..

نامۆ : لە دوای ئەو شەش مانگەی دوایی ؟

خاتوو : دایکی ئەمریکاییە ، ئیتر نیوەی خوێنی بیانیە ، ئەگەر ئیتاڵی و روسیاییشی تێدا نەبێت .

نامۆ : ( بەسەر لەقاندنەوە ) تێگەیشتم .

خاتوو : ئەوە بوونەوەرێکی ناڕەسەن و ناتەواوە ، بەڵام بەسوودە .

نامۆ : بەسوودە !

خاتوو : لە زۆر تەنگوچەڵەمەی ئەو رۆژگارەدا مەسەلەی برازام رزگاری کردووم .

نامۆ : بەڵێ تێگەیشتم .

خاتوو : ئەمشەو و ناسنامەکانی لێوەردەگرم و بۆ بەیانی رەوانەی نووسینگەی عەریفیان دەکەم تا سەیریان بکات .

نامۆ : بەڵام ئەگەر عەریف بەمەی زانی ؟

خاتوو : ( بەنەرمی ) بە تاکید دەشزانێت !

نامۆ : ئینجا بەمە بزانێت و لەگەڵ داگیرکەرانیشدا هاوکار بیت !

خاتوو : ئەمە شتێکی ئاسانە ، ئەو برازایەم میراتگری منە .

نامۆ : ( گوێی بۆ شل کردووە ) ئای ئای

خاتوو : سوپاس بۆ خوا ، کە لەگەڵ تۆدا هێندە جیاوازی نیە رەنگی لە تۆ دەکات ، عەریف بەیانی کە وێنەی ئەو دەبینێت . سەری سوڕ دەمێنێت ، ئێستە پێم بڵێ لە

دارستانی ئێمەدا چیت دەکرد ؟ بۆ کوێ دەچیت ؟ ( یەکسەر وەڵام ناداتەوە ) بگەیتە سەر شەقام وانیە ! ( بەهێمای بەڵێ سەری دەلەقێنێتەوە ) سەر شەقام هێشتە ماوەی چوار یا پێنج رۆژی ماوە ، قاچەکانیشت ماندوو دیارن .

نامۆ : ئەوە دەزانم .

خاتوو : لەسەر ئەو شەقامە هاورێت هەیە ؟

نامۆ : لەسەر قەراغ هاورێم هەیە دەمگەیێننە بەلەمێك بەلام لەم ناوە تا دەگەیتە قەراغ دەریا کەس ناناسم .

خاتوو : ( هەڵدەستێتەوە ) پێویستە بە لیستی ناونیشانی هاورێیکانم ( بێدەنگی ) دابچمەوە ، تۆ لە چ هێزێکدا بووی ؟

نامۆ : لە سوپا .

خاتوو : چ پەلێك ؟

نامۆ : حەفتاو نۆیەمین .

خاتوو : ( نەختێك رامان ) ناوی سەرۆکت چی بوو ؟

نامۆ : ( دیلافۆرت ) لە یەکەمین حەفتەدا کوژرا ، ئێستا (ساتن) شوێنی گرتووەتەوە .

خاتوو : ( بۆ مێزی نووسین دەچێت ) ئەوەی لەگەڵ دوژمندا هاوکار بێت ناتوانێت زۆر وریای خۆی بێت ، ئێستا سەیری یادنامەکەم دەکەم ، رەنگێکی جوان ! سێبەری سوور دڵگیرە، وانیە ؟

نامۆ : بەڵێ ، بەڵێ .

خاتوو : لە دوای شەقامە یەکدیبڕەکە ، کێڵگەیەك لە ڕێگەی (مونای ) دا هەیە ، ڕێگەکە دەچێتەوە نێو گوندی (ستیڤی پیرۆن) ( بێدەنگ دەبێت و رادەمینێت ) .

نامۆ : ئەوێیە بنکەی ئەو عەریفەی تێدایە ، جارێکی دیکە نامەوێت بیبینمەوە و لەگەڵیدا تووشی گیروگرفتی دیکە ببمەوە .

خاتوو : نەخێر ، ئەو کەرایەتییەی کردی ، دووبارەی ناکاتەوە ، دەچێتە کێڵگەی بنەماڵەی (شێرفیل ) شوێنێکی خۆش و گەورەیە ، خواردنت دەدەنێ دەشتشارنەوە .

نامۆ : بەڵام من لە مەڕ برازات نیگەرانم ، لەو باوەڕەدام رۆژێك دەبێت ئەو عەریفە لە شوێنێك چاوی پێبکەوێت .

خاتوو : بە هەموو مانایەك ئێمە یاری بەژیانی خۆمان دەکەین ، بەڵام هەرگیز دەبێت پێی قایل بین ، چونکە فەرمانبەرانی ئێوە لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا ئاڵوگۆریان پێدکرێت ، بڕوا ناکەم هیچ رۆژێك لەو برازایەم داوای ناسنامەی لێبکەن ، ئەو هەردەم بۆشتە و خانەدان دیارە ، لە پیاوی واش کەم داوای ناسنامە دەکرێت ، دەشتوانیت لەو چوونەت پاشگەز ببیتەوە !

نامۆ : ئەو ڕێگایەی گرتوومە تا دەمرم وازی لێناهێنم .

خاتوو : نا ، نەخێر من مەبەستم ئەوە نیە ، ڕێگاکە زۆری ماوە .

نامۆ : بۆ من نیگەران مەبە ، ئەگەر ئەمشەویش نەبێت ، چەند شەوێکی دیکە دەگەمە سەر ئەو شەقامە . من ئێستە لە نووستنی سەر زوی و چۆڵەوانی لێراهاتووم و باکم نیە .

خاتوو : پێش ئەو شەرە ، ئەو ماڵە دوازدە خزمەتکاری تێدابوو ، ئێستە تەنیا سیمۆنم ماوە ، دڵێکی گەورەی هەیە ، وانیە ؟

نامۆ : دڵی شێری هەیە .

خاتوو : هەوڵ بدە ئەو ناونیشانە لە بەر بکەیت ، (کرسیت) شەقامی (فۆش) ژمارە ( ٤٠ ) دەرگای دواوە .

نامۆ : ( چەند جار دەیڵێمەوە ) ( کرسیت ) شەقامی (خۆش) ژمارە (٤٠) دەرگای دواوە .

خاتوو : لەوانەشە بەزەحمەت بگەیتە ( کرسیت ) بۆیە (مانز)یشت لەلابێت ، ئەو کابرایە لە مەیخانەی ( شێری سوور) دا مەیگێڕە .

نامۆ : ( چەند جار دووبارە دەکاتەوە ) مانز ، مانز .

خاتوو : هەروا ناوی ( دینیس )ی ئاسنگەریشت لە بیر نەچێت کە ئەویش لە ناوچەی (لالوب)ە شەوی داهاتوو ، چەند هاوڕێیەك دەتگەیێننە قەراغ دەریا ، بۆ جلوبەرگیش خەمت نەبێت ، بۆتی پەیدا دەکەن . ( لە دەرەوە دەنگی عەریف بە تووڕەییەوە دەبیسترێت ) سیمۆنیش قیژە قیژی لێوە دێت ) پێت دەڵێم هیچ شتی وانەبووە ، ( لەبەر هاوار و قیژە قیژەکە وشەکان بە تەواوەتی نابیسترێت ) دەرگا دەکرێتەوە ، عەریف سیمۆن بە دوای خۆیدا رادەکێشێتە

ژوورەوە ، ئەویش هەوڵی ئەوە دەدات خۆی لە دەستی رزگار بکات ) .

سیمۆن : ( بەترس و تووڕەیی و هاوارەوە ) وازم لێبێنە ئیبلیسی چەپەڵ ، ئەی دڕندەی بیانی ، ئێوە بکوژن ، وازم لێبێنە ( دیسان دەیەوێت لێی دوور بکەوێتەوە ) .

عەریف : ( لەو کاتەدا ) بەسیەتی بووەستە ، ئەی ئەگریسی بچکۆڵەی درۆزن و فێڵباز .

خاتوو : ئایە یەکێکتان دەتوانن هۆی ئەم گاڵتەپێکردنەم بۆ روون بکەنەوە .

عەریف : ئەم ناپەسندە ..

خاتوو : باسکی بەردە ئەی عەریف ، ئەم کچە راناکات .

عەریف : ( باسکی بەر دەدات ) لەم خۆشەویستەتم بیست بە باخچەچییکەتانی دەگوت من ئەم پیاوەم پێشتر نەبینوە !

سیمۆن : ئەمە راست نیە ! لەبەرچی ، وا دەڵێم ؟

عەریف : بەگوێی خۆم گوێم لێبوو ، بەهەردوو گوێم مەبەستت چی بوو ؟ پێم بڵێ .

خاتوو : ئەی عەریف تۆ بە زوبانێکی پاراوی ئێمە دەدوێیت بەلام لەبەر ئەوەی ناتوانیت زوو تێبگەیت .

عەریف : بەڵێ زۆر چاك لە زوبانەکەتان دەگەم .

خاتوو : ئەوەی ئێستا تۆ لەدەمی سیمۆنت بیستووە ، دەمێکە ئەوەی لە نێو هەموو خەڵکی ناوچەکە گوتووە .

عەریف : ( بڕوا ناکات ) چۆن تێی ناگەم .

خاتوو : چونکە برازام ، بەهرەیەکی زۆری هەیە ، کەچی پاکوخاوێن و ڕێکوپێک نیە ، لە مەسەلەی پاڵتۆکەش بە چاوی خۆت بینیت .

سیمۆن : ( بەتووڕەیی و سووکایەتیەوە ) فلتەری جگەرەو و چەرچەف و پەشتەماڵ و کتێب و کاغەز وەك لافاو بە ژوورەکەی خۆیدا فڕێ دەدات ، هەموو ڕۆژێك دوو سەعات تەنیا ژووری ئەم کوڕە بێ سەروبەرە خاوێن دەکەمەوە ، ئاوی گەرمی بۆ دێنم ، گوایە ریشی دەتاشێت ، کەچی ئاوی سارد دەبێتەوە ، جارێکی دیکە ئاوی گەرمی بۆ دەهێنمەوە ، هەر جارێك کە بێتە ماڵەوە پتر لە دە کەڕەت بەسەر ئەو پلیکانانە سەر دەکەوم .

ئامۆ : من داوام نەکردووە بێتە سەرەوە ..

سیمۆن : ( بەسەر سوڕمانەوە ) ئای ، ئای هەڵبەتە تۆ داوام لێناکەیت ، ئەی وا نیە ؟ ئەی پێت نەڵێم چیت پێویستە؟ پێت نەڵێم چی دەخۆیتەوە ، پێت نەڵێم چی دەخۆیت ؟ کەی دەخەویت و کەی هەڵدەستیت ؟ ئەی .. ئەمانە ( ڕوو لە عەریف دەکا ) هاتوچووی ناوێت ) .

خاتوو : بەسیەتی ، بەسیەتی خۆ عەریف بینیت ؟

عەریف : خاتوو سوێندت بۆ دەخۆم .

خاتوو : ئەم مەسەلەیە ( بەهێمنی دەدوێت ) پێویستی بە ڕەوشت بەرزی هەیە ، منیش نامەوێت کەسێك ببینم کارەکەرم پەلکێش بکات .

عەریف : بەس نەیدەویست بێتە لای تۆ .

خاتوو : بەهەرحاڵ حەز دەکەم پیاوێکی چاك بیت ، برازام دەیەوێت دوو سبەی بچێتە گوندی ( کرسیت ) پێویستی بە بەڵگەنامەی پەڕینەوە هەیە ، لەوانەیە تۆ بتوانیت بیدەیتێ .

عەریف : بەڵام ..

خاتوو : ئێستە لە باخەڵتدا پاسەپۆرتێکی بچووك هەیە ، وانیە ؟

عەریف : بەڵێ ، بەڵام من ..

خاتوو : وا چاکە بۆ دوو ڕۆژ ئەو پاسەپۆرتەمان بۆ بەکاربهێنێت ، ئەم برازایەم دوو دڵە و ، حەز ناکەم لە سەفەرەکەی خۆی پاشگەز ببێتەوە .

عەریف : من مافی ئەوەم نیە ، پاسپۆرتی خۆم بۆ هیچ کەسێك بەکار بهێنم .

خاتوو : باشە کە من پێویست بم ، وا داوات لێدەکەم !

عەریف : ئەوەی دەیڵێت پێشتر پێویستە ڕەزامەندی بۆ وەربگیرێت .

خاتوو : ئایە گومان لەمە دەکەیت ئەگەر نیازم وابێت برازام ڕەوانەی شوێنێك بکەم کەس هەبێت ڕێگای لێبگرێت .

عەریف : نەخێر ، خاتووی بەڕێز ، کەس نیە ڕێگای لێبگرێت.

خاتوو : کەواتە پیاوێکی چاك بە زۆر جار بووە پیاو لە پێنج دەقیقە دوو ئیشی خراپ دەکات ، ئەو پێنووسەم زۆر جوانە وانیە .

عەریف : نەخێر ، خاتووی بەرێز ئێمەی ئەڵمان ماوەیەکی زۆرە وازمان لە پێنووسی پەراموو چەدار هێناوە .

خاتوو : بەڕاستتە ؟

عەریف : ( روو لە نامۆ دەکات ) ژمارەی پسوولەکەت چەندە؟

نامۆ : بیرم لە ژمارەکەی نەکردووەتەوە .

عەریف : چۆن ژمارەی کەسێتیت نازانیت ؟

نامۆ : تەنیا ئەم ژمارەیەم لە بەر کردووە ، ژمارەی پسوولە یان سیبە .

سیمۆن : من ژمارەکە دەزانم .

خاتوو : ( بەترسەوە ) سیمۆن ئەمە بڕوا ناکم .

سیمۆن : ( وەکو بزانێت چی لە خەیاڵی خاتووندا هەبێت بە دڵنیاییەوە ) بەلام بە تاکید خاتوی بەرێز ژمارەی ئەو ساڵەیە کە تێیدا لە دایك بووە و دوو یەکیشی بەدوایەوەیە، ئەم ژمارەیەم چەند جار لە سەر بەرگی ناسنامەکەی بینیوە.

عەریف : چاکتر وایە ژمارەکە بزانین .

سیمۆن : ژمارەکە – ١٩٢٤١١ یە .

عەریف : ژمارەی ١٩٢٤١١ ( دەنووسێتەوە ) .

خاتوو : ئێستە دەچێتەوە ناوچەی ( ستیڤی پیرۆز ) وانیە؟

عەریف : بەڵێ وایە .

خاتوو : زۆر چاکە ، لەوانەیە بتوانیت برازاکەم لەگەڵ خۆتدا بگەیێنێتە سەر دوریانی ڕێگەی سەر شەقامەکان لە (مارنای).

نامۆ : بەڵام منت بەسواری ئۆتۆمبێل هێنا !

خاتوو : کاتێ لە هەڵاتووەکان بوو سواری ئۆتۆمبێلت کرد، ئێستەش کە دەزانیت برازامە سواری ناکەیت .

عەریف : کە هێنامە ئێرە ، ئەرکێکی سەربازی بوو .

خاتوو : ( بەگفتی جوان و شیرینەوە ) ئەم ئێوارییە لەگەڵ مندا ڕەفتارێکی ناشیرینت کردووە ، پیاوێکی چاك بە لەوانەیە لەو نزیکانە ببیتە ئەفسەر ، بۆیە وا چاکە هیچ گیروگرفتت بۆ پەیدا نەبێت .

عەریف : ئەگەر بمبینن مەدەنیەکم سواری ئۆتۆمبێلی سەربازی کردووە ، پلەی ئەفسەری بە چاوی خۆم نابینم .

خاتوو : ( بەدەنگی نزم ) ئینجا ئەگەر لە سەر هەڵسووکەوتی ئەم ئێوارەیەت ڕاپۆرتێك پێشکەش بە سەرکردەکانت بکەم ئەوا بۆ بەیانی تۆ لە سەربازی دەرکراوی .

عەریف : ( دوای ماوەیەکی زۆر بێدەنگی ) ئایە بەڕێز ئامادەیە ئێستە بڕۆین ؟

نامۆ : من ئامادەم .

عەریف : پێویستیت بە پاڵتۆ نیە ؟

خاتوو : سیمۆن پاڵتۆیەکەی بۆ بهێنە ، لە دۆڵابی ژووری نووستنە .

سیمۆن : باشە ، بەڕێز ( سیمۆن دردەچێت ) عەریفیشی بەدوای سیمۆنەوە دەچێتە دەرەوە .

نامۆ : وادیارە لە فرۆفیڵی سیاسیدا گەلێك بەهرەمەندی .

خاتوو : لە کێڵگەکە تەویلەیەك هەیە ، بەزەردی رەنگ کراوە وا چاکە تا ئێوارە تێیدا چاوەڕوان بیت .

نامۆ : خۆزگە پوورێکی وەك تۆی فیداکارم دەبوو ، پوورەکانی من جگە لە درووماندن چیدیکە نازانن .

خاتوو : خۆزگە تۆش بە راستی برازای من دەبوویت بڕۆ خوات لەگەڵ ، ئاگاداری خۆت بە ! بەڵکو رۆژێك دەگەڕێیتەوە ژەمەنانێك بەیەکەوە دەخۆین و کۆتایی ئەم چیرۆکەم بۆ دەگێڕیتەوە .

( لە دەرەوە گرەی مەکینەی ئۆتۆمبێل دێت ) .

نامۆ : لەوانەیە لە دوای دوو ساڵی دیکە بگەڕێمەوە .

خاتوو : لەوانەشە یەك ساڵی دیکە بێت .

نامۆ : ( بەسۆزەوە ) ( دەستی خاتوو ماچ دەکات ) بڕواناکەم بتوانم پاداشتی ئەم چاکەیەی تۆ بدەمەوە (دەچێتە دەرەوە) (بەدەنگی بەرز لە دەرەوە ) سوپاس بۆ ئەم پاڵتۆیە سیمۆن (دەنگی دەرچوونی ئۆتۆمبێل ) .

سیمۆن : خاتوو چیت دەویست !

خاتوو : ئەو پەرداخە مەیە لەگەڵ مندا دەخۆیتەوە .

سیمۆن : خاتووی بەڕێز چۆن وا دەبێت !

خاتوو : بەڵێ ، دەبێت ، تۆ کچی گەورەی گەلی فەرەنسایت و کارەکەرێکی دڵسۆزی منیشی ئەو مەیە بۆ یادی سەرکەوتن دخۆینەوە .

سیمۆن : بەڵێ خاتوو ، ئەوەی تۆ دەیفەرموویت .

خاتوو : ( بەدەنگی نزم ) یادی ئازادی .

سیمۆن : ( دووبارەی دەکاتەوە ) یادی ئازادی ، خاتووی بەڕێز ئایە دەتوانم منیش شتێك بخەمە سەر ئەم یادە پیرۆزە.

خاتوو : بێ گومان .

سیمۆن : ( بەدڵ رەقییەوە ) با عەریفیش ملی بشکێت .

سەرچاوە / لە کتێبی
English one acitplays of today
ئەسفار – ژمارە ٣ –

# بـــــــۆق

تـسۆگی کۆنیـۆ سـاڵی ١٩٢٥ لـە تۆکلیـۆ لـە دایکبـووە . لـە زانکۆکانیـدا وانـەی لـە ئـەدەبی فەرەنـسەوی خوێنـدووە . لـە ماوەی خوێنـدنی بـالا ، دەسـتی بـە بلاوکردنـەوەی چیرۆکی کـورت کـردووە . لـە سـاڵی ١٩٥٦ لـە زانکـۆی باکۆشـوین بـە مامۆستا دادەمەزرێت و ئیدی خۆی بە رەخنـەی ئەدەبییـەوە خەریکدەکات .

کۆنیۆ لە ساڵەکانی دوایی تەمەنیدا بەهرەی رۆماننووسینی لێبەدیار دەکەوێت کە ساڵانی ١٩٥٧ تـاکو ١٩٦١ لـە ئـەورووپا دەژیت و دیمەن و بیرەوەری دوورە وڵاتـی کارێکی گـەورە لـە نووسینەکانی دەکەن و ، سیمای شار و دێیە ئـەورووپاییکان بە چیرۆکەکانیەوە دیارن ، چیرۆکی بۆق چیرۆکێکی گرنگە و لـــە بـــەرگێکی جـــوان بـــە ناونیـــشانی – زنجـــیرە چـــیرۆکە ژاپۆنیەکان– لە پاریس بلاو بووەتەوە .

## بۆق

ئەگەر بە بیرم بێتەوە ، مانگی ئەیاری یەکێك لە ساڵەکانی پەنجاکان بوو کە لە گەڕەکێکی باشووری پاریس لە باخچەی —سو—ی نێو مۆزەخانەکانی — لیل دی فرانس — پێشانگایك کرایەوە . خۆم و خێزانم بەم بۆنەیەمان زانی چونکە دەمێك بوو پێشتر کە لە میترۆدا بووین پۆستەرێکی دیوارمان بەم بۆنەیە خوێندەوە .

وابزانم ئێمە نەدەچووینە ئەم پێشانگایە ئەگەر تابلۆی — سواڵکەر—ی هونەرمەندی — بۆسش — ی تێدا نەبووایە . لە راستیدا دانەیەك لەم تابلۆیە لە مۆزخانەی — سان جرمان ئۆنلای — ی نێو پاریسیشدا هەبوو و پێویستی نەدەکرد ئەو رێگایە دوور و درێژە بکوتینەوە و بچینە ئەوێ کە لە گەڕەکێکی دووری باشووری پاریسدا بوو . بەڵام ئێمە ماوەیەکی زۆر بوو پاریسمان بەجێهێشتبوو و مۆزەخانەکەی نێو پاریسمان نەبینیبوو .

جگە لەمەش لەو کژەی ساڵدا گوڵێ لەیلەك دەپشکوێت و ئینجا ئێمەش زۆر حەزمان لەوە بوو کە سەیری باخچە جوانەکانی کۆشکی — سو — بکەین ، کە لە جوانیدا هاوتای نەبوو مەگەر باخچەکانی کۆشکی ڤەرسای نەبێت .

رۆژێکی تابلێی خۆش بوو ، تالی خۆر بەسەر ناوچەکە پەرش و خاو ببووەوە ، گوڵەکانی لەیلەك دەدرەوشانەوە و دیمەنێکی زۆر جوان و دڵگیریان پێکهێنا بوو .

کۆشکی – سو – بینایەکی دڵڕفێن بوو و لە سەر شێوازی ئەندازەی چەرخی هەڤدەهەم دروستکرابوو .

لەو هەیوانەی بەرانبەر باخچەکان زۆر بە جوانی دەتتوانی ئاوی حەوزی ئەو دیوی دارستانەکان ببینیت کە تێیدا چەندین مراوی مەلەیان دکرد . لەبەر دەرگای بالکۆنەکە خێزانم چاوی بە ئافرەتێکی رەشبۆشی نیمچە بەتەمەن کەوت. لەو کاتە من کە بەرەو باڵکۆنەکە دەچووم ، چەند هەنگاوێك لە خێزانی خۆم دوور بووم ، کاتێ ئاوڕم لێدایەوە، سەیرم کرد خێزانم لەگەڵ ئەم ئافرەتە لێقەوماوە مشتومڕیانە و ، بەڵام من هیچ لە قسەکانیان تێنەگەیشتم .

لە خێزانم نزیکبوومەوە ، سڵاوم لە دەستەخوشکەی کرد، لە نێو ئەم پۆشمینە رەشە تەنکەی کە بەسەر روخساریدا درابوو توانیم ئەو دوچاوە رەنگ خۆڵەمێشییەی خاتوو (دنیس – ف) بناسمەوە کە بەم نازناوە خێزانم بەیەکدی ناساندین و ئەوەی لە بیرم کرد بیڵێم هەردوو چاوەکانی بوون کە دیمەنێکی پڕ لە ترسیان دەنواند و لە هەمان کاتیشدا پرسیار و ناقایلییەکی ئێجگار زۆریان تێدا بەدی دەکرا .

دوای ئەوەی خاتوو ( دنیس – ف ) مان بەجێهێشت ، لە خێزانی خۆم پرسی :

– واپێدەچێت خزمێکی نزێکی مردووبێت !

– ئەم ئافرەتە ماوەیەکی زۆرە ئەم جلکوبەرگە رەشانەی پۆشیوە و هەڵسوکەوتیشی زۆر غەمگین دیارە ، منیش کە

یەکەمین جار لە نێو ئەم جلکوبەرگە رەشانەم بینی لە دڵی خۆمدا گوتم لەوانەیە کەسێکی دڵسۆزی مردووبێت و ، بەڵام وادیارە بەپێچەوانەی مەزندەی ئێمەیە ، ئەم ئافرەتە وا هەست دەکات بێوەژنە و کەچی هێشتا شووی نەکردووە .

– لەوانەیە دۆستێکی لە جەنگدا گووم کردبێت .

– بەهەرحاڵ ئەمە ئافرەتێکی سارد و سڕە ، زۆریش خوێن ساردە ، دەشڵێن شێتە و کەس نایدوێنێت . بۆ نموونە لە کاتی خۆیدا کە لە ژووری خوێندن دەبووین ، ئەم ئافرەتە لە قوتابیان دوور دەکەوتەوە و ، بەتەنیا دادەنیشت و ، ئینجا کە لە پۆل دەردەچووین هەموومان بە دوای مامۆستاکەمان دەکەوتین و لەگەڵیدا دەدواین یا پرسیارمان لێدەکرد ، کەچی ئەو لە دواوە بە تەنیا دەمایەوە ، هەندێ جار بەزەییم پیا دەهاتەوە ، ئەو دەفتەرەی تێبینییەکانم تێدا دەنووسییەوە بە ناچاری دەمدایێ و بۆ ماڵەوەی دەبردەوە. بەڵام من هەموو جارێك یەك شت سەرنجی رادەکێشام ئەویش ئەوەبوو کە دەفتەرەکەی بە پیسی بۆ دەگەڕاندمەوە، وەکو ئەوەی بڵێی ساردی دەست و پەنجەکانی دەفتەرەکەی شێدار کردبێت .

ئەمەش وایلێدەکردم کە بیر بکەمەوە تاکو جارێکی دی هیچ دەفتەرێکی دیکەی نەدەمێ .

من لە کاتێکدا گوێی خۆم بۆ قسەکانی خێزانم شل کردبوو ، ئەوەم بەبیرهاتەوە کە دەستی خۆم لە نێو دەستی (دنیس–ف)ێ نا ، هێشتا هەست بە ساردێتی دەست و پەنجەکانی

خۆم دەکەم . بەڵام ئێمە هێشتا لە گەرمەی قسەکاندا بووین سەیرمان کرد تابلۆیە مەزنەکەی بۆسش لە بەر دەممانە و لە کۆتایی هۆڵەکە هەڵواسراوە ، بە ئامادە بوونی ئێمە دیمەنی نێـو هۆڵەکـە بـەگورتر بـوو ، تابلۆیەکـە بـریتی بـوو لـە ئاسمـانێکی رەنـگ نائاسـایی نـامۆ ، هێلکارییـەکی رەنـگ پەمـەیی مەیلـە و سـووری بەترسـی بـیٰ کۆتـایی ، هەنـدیٰ کەسێتی شێوە ئەفسانەی تێدا هێڵکێش کرابوو ، وێنـەی قـەرەجێك بە بوورەکی لە نێو قەفەسۆچکەیەك نـابوو و بـە کەمەری خۆی هەڵواسیبوو و ، سەگێك ، ئینجا بۆقێك لەسـەر مێزێك قیت دانیشتبوو ، پیرەمێردێك بۆ سەیر کردنی بۆقەکە خۆی بۆ پێشەوە چەماندبووەوە ئەمانـە تـەواوی دیمەنـەکانی نێو تابلۆیەکە بوو . لەم کاتـە خێزانم قیژەیـەکی لێوەهات ، گوتی :

– ئـای ، ئەمـە بۆقەکەیـە ! پەنجـەی بـۆ بـۆقێکی دی نێـو تابلۆیەکە درێژ کرد کـە رەنگـی چاوی لـە ئاڵتوونی دەکرد و پیرەمێـردە چـەماوەکە تونـد گرتبـووی و دەمـی پێبـەش کردبووەوە .

هێشتا ئـەو گفتوگۆیـەم بـەبیر دێتـەوە کـە لـە مـەڕ تابلۆیەکـە کردمان لە دوای ئەمە بە دوو ساڵ ، سەر لـە نـویٰ چوومـەوە مۆزەخانـەی – سـان جرمـان ئۆلای – و لەوانەیـە چوونەکەم لەبەر ئەو مەبەستە بوو کـە بتوانم لە تێبینییـەکانی خـۆم پـتر دڵنیاببمەوە ، هەڵبەتـە ئەمـەش وا رێککـەوت کـە خێزانم ئـەو کاتـە بـە کۆبوونەوەیـەك خـەریکبوو ، ئیتر بـە تـەنیا سـواری

پاس بووم و بەرەو باشووری پاریس بە رێکەوتم ، دوای نیوەڕۆیەکی پاییز بوو ، دنیا نیمچە تاریك و باراناوی بوو ، ئەو هۆڵەی تابلۆی بۆقەکەی تێدا بوو هێمن و چۆڵ بوو ، بەلآم ئافرەتێکی رەشپۆش سەرنجی راکێشام کە لە پێش تابلۆیەکە چەقیبوو و ، لە کاتی هاتنە ژوورەوەم ئەو خەریکبوو دەچووە دەرێ ، کاتێ بە پێشی تێپەڕیم لە نێو ئەو پۆشمینە رەشە تەنکەی کە سیمای دەموچاوی داپۆشیبوو خاتوو ( دنیس – ف )یم ناسییەوە ، کە هەردوو چاوەکانی ترسیان دەباراند ، بۆم نەلوا سلآوی لێبکەم و لە هەواڵی بپرسم ، لە بەردەمم وەکو سێبەر تێپەڕی .

لە ئێوارێیەکەی ئەو رۆژە من لە چێشتخانەیەکی بچووك دانیشتبووم و، لە جامی پەنجەرەوە سەیری دیمەنی شارم دکرد و ، باران نمە نمە دەباری . دەمێکی پێچوو خێزانم گەیشتە ئەوێ و دەستی بە قسان کرد ، گوتی :

– ئای ، پێم بڵێ تابلۆیەکەت چۆن بینی ؟

– زۆر جوان بوو .. ئەو ئافرەتەشم لەوێ بینی کە لە – سو – پێکەوە بینیمان .

یەکسەر واقی وڕما ، پرسی :

– تۆ دڵنیایت ؟

– بەڵێ تەواو دڵنیام .. وەکو ئەو جاریش جلکوبەرگی رەشی پۆشیبوو .

خێزانم دەمێکی تەواو بێ دەنگ بوو .. لە دوڕ چاوم راما ، گوتی :

- پیاوەکە ، ( دنیس - ف )یَ ماوەیەکی زۆرە مردووە !
هەستم کرد دنیا هەمووی وەکو خولگەیەك وایە و پێیەوە لکێنراوم و تیژ دەڕوات ، هێلنجێکم کرد، دانم بەخۆمەوە گرت و خۆم بە کورسییەکەی خۆمەوە نووساند .
دڵۆپە ئاوەکانی باران وردە وردە گەورە دەبوون، خەریکبوو لە نێویدا بخنکێم .. دیمەنی دەم و لێوی خێزانم بووە خاڵێك و وردە وردە بچووك دەبووەوە تاکو نەما .